# پەیامە روحیەکان



نووسینی: سەیید قوتب
و/ هەردی ئەنوەر

# پەیامە ڕوحیەکان

نووسینی : سەیید قوتب

وەرگێڕانی لە فارسیەوە: هەردی ئەنوەر

پێداچونەوەی : هەردی ئەنومر

نۆرەی چاپ : چاپی یەکەم

تیراژ : ١٠٠٠ دانە

ساڵی چاپ : ٢٠١٣

نرخ : (٣٠٠٠) دینار

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارەی سپاردن (٢٦١٥)ی ساڵی (٢٠١٣)ی پێدراوە

دەسپێك...

ئاشنایەتیم لەگەڵ سەیید قوتب ئاشنایەتیەکی روحیانەیە.. هەر بۆیە ئەم پەیامە روحیانەم خستە بەردەم ئێوەی خۆشەویست، نەك من هەر کەسێك وتەکانی سەیید قوتب لێوباران بکات ئاوا دەبێتە روحی.. چونکە سەیید قوتب نووسینەکانی لەسەر (پەیامە روحیەکان)ە..!!

پەیامە روحیەکان ئەو وتانەن کە(سەیید قوتب)ی لەسەر لە سێدارە درا... ئەوەی لەم چەند لاپەڕەدا دەیخوێنیتەوە چەند بابەتێکی روحین کە گیان بە لاشە مردووەکاندا دەکات.. گیان بە بەر دڵ و مێشکی مردوودا دەکات..!

چێژ وەرگرتن لە قورئان کاتێ چێژی لێ وەردەگیردرێ کە ئەو چێژە وەرگیرابێ وەك سەیید خۆی لە پێشەکی تەفسیرەکەیدا باسی دەکات.. خەلاتێکی خواییە! لەکاتی خوێندنەوەی ئەم چەند لاپەڕەدا دەتوانین بەتایبەت لە تەفسیری سورەتی(الاخلاص)دا لە شاکارە بەناوبانگەکەی(فی ظلال القران) کە وەرمگرتووە هزری سەیید بۆ ئەو کەسانە روون دەکاتەوە کە گومانیان لە شەهید بوونی هەیە!

پاش ئەوە سەیید رووە سەرەکیەکەی ئەمریکا لە بەشێکی کتێبەکە دەخاتە ڕوو کە ئەویش ئیسلامی ئەمریکایە، ئەمریکای ئیسلامی ئەو ئیسلامەی ئەمریکا دەیخاتەڕوو و دەیەوێ! بە تەواوی لە چەند دێڕێکی کورت و پوختدا شیٚ دەکاتەوە.

خۆم هیچ کاتێ لە شەئنی ئەوەدا نابینم توێژنەوە و خوێندنەوە بۆ بابەتەکانی سەیید بکەم نەك من هەر کەسێ وەك ئەو ژیا ئەتوانین بلێین ئەوە بەڕاستی شایەنی ئەوەیە(پەیامە روحیەکان)ی سەیید شی بکاتەوە و وەکو وانە بە تاکی کوردی موسڵمان بڵێتەوە تا عەقیدەی خۆیانی پێ خاوێن بکەنەوە.. نەك ئەم کتێبە بەڵکو هەموو نووسراوەکانی تری سەیید (پەیامی روحین) بۆیە ئەم چەند بابەتەی کە وەرمگێڕا هی سەیید قوتبن و لەم کتێبەدا کۆمکردەوە و ناوم نا(پەیامە روحیەکان).. بە هیوای ئەوەی سوودێکم گەیاندبێ بە کتێبخانەی کوردی و هەر تاکێکی کورد..!

وەرگێڕ
٢١/١٠/٢٠١٣
هەولێر/ بنەسلاوە..

# لە سێبەری قورئاندا ئەوەی دیتم و فێربووم

ژیــان لــە ســێبەر قورئانــدا نیعمەت"خەڵات"ێکــە.. نیعمەتێکــە کــە هێــز و بایــەخی ناناسـێت جگــە لــە کەسێك کە چێژی کردووە. نیعمەتێکە کە بەرەکـەت دەخاتە ژیانەوە و پاك و پیرۆزی دەکات.
سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە لەسەر بەندەی هیچی خۆی منەتی کردووە تـا رۆژگارێك لـە سـێبەر قورئاندا ئارامم گرت و چێژی نیعمەتێکم کرد کە لە ژیاندا هـیچ کـات نەمچەشـتووە. لـەم مـاوەدا بەشـدار بـووم لـە شـیرینی نیعمـەتێك کـە بەرەکـەت دەخاتـە تەمەنەوەو پاك و پیرۆزی دەکات.
دەمبینی کە خوای گەورەی پاك و بێگـەرد، بـە هـۆی ئەم قورئانەوە کە چۆن لەگەڵ منی بەندەی بچووك و کــەم"هیچ" قســە دەکــات. بەڕاســت بــۆ مــرۆڤ چ گەورەییەك لەم گەورەییە ئاسمانیە گەورەترە.؟ ئـەم قورئانە تا چ رادەیەك تەمـەن فرەتـر دەکـات؟ خـوای مــرۆڤ چ پلــە و پاییــەکی گــەورەی بــە هــۆی ئــەم قورئانەوە داوە بە مرۆڤ"مرۆ"؟
لە سایەی قورئانـدا، ماوەیـەك ژیـام و لـەو شـەپۆلەدا تەماشــای نــەفامیم دەکــرد کــە لــە پانتــای زەویــدا

شەپۆلی دەدا. دەمبینی کە دانشتوانی گرنگی بە شتانێکی بێ نرخ و هیچ خۆشەویستیان دەردەبڕی و لە ڕێگایدا هەوڵیان دەدا.

دەمبینی ئەم نەفامانە، دڵپاچەی و دۆڕاوی زانیاریانێکن کە بە زانین و بیری پوچ و هەوڵدانە منالآنەپووچەکەی خۆیان دەچوو. وەك پیاوێکی بەتەمەن گەورە وابووم کە تەماشای ڕەفتاری منالآنەی بێ سوودیان بکات و هەوڵدانیان بخاتە ژێر چاودێری خۆیەوە و کە بە گوفتاری گەنگیان کە تازە زمانیان بکرێتەوە و وتەکانی بە پێچەوانە دربڕن گوێیانی بۆ هەڵخسبێ.. لە سەر سوڕماندا بووم کە ئەوە خەڵکی چی دەکەن؟

بۆچی لە زەڵکاوی تاریك و چەپلآوی چەقیون و هەڵیان بژاردووە و بۆ ڕزگاری خۆیان گوێ هەڵناخەن بۆ ندای ئاسمانی گەورە کە ئەوان بانگ دەکات، ندایەك"بانگردێك" کە تەمەن فرە و پیرۆز و پاك دەکات؟

لە سێبەری قورئاندا، ماوەیەك بە ئەم بیرکردنەوەتەواو و ئەوەی لە خۆدەگرێت کە نرخی پێ دەدات و پاك و پیرۆزی ڕایدەگرێ و هەموو دونیا و بە تایبەت مرۆ کامڵ دەکات و بەرەورووی ئامانجی کۆتای بەرز دەکاتەوە کە پێ ی ئاشنا بووم. ئەم

بیرکردنـەوە گـەورە لەگـەڵ ئـەو بیرکردنـەوە کـەم و کورتانەی تر و نەزانییەك کە مرۆڤ لە ناویدا تەپ و تلی دەکرد و لـە رۆژهـەڵات و رۆژئـاوا و بـاکوور و باشـوور لەگـەڵی دەژیـا بـەراوردم کـرد، لـە خـۆم دەپرسـی: چـۆن ئادەمییـەت لـەم چڵکاوە بۆگەنـە و چاڵە تاریکە دەژی، لە کاتێکدا لە تەنیشتی ئەو، ئـەم چراخان و سەوزەلانییە دڵڕفێنە و سەرچاوە زوڵاڵە و خۆشە و جێگای بەرز و نوورانی هەیە؟
لە سایەی قورئاندا دەمبینی کە لە نێـوان مـرۆ، هـەر وەك ئەوەی خواییەکەی دەیـەوێ، وە لـە نێوان ئـەم دونیایەی کە پەروەرێنی دروسـتی کـردووە، هاوکـاری و هاودەنگییەکی توونـد و جوان جێگیر بووە. کاتێـك زۆر بە ورتر تەماشام دەکرد، دەمبـینی کـە خراپـە و خراپـەکاری و شـەڕ و ئاژاوەیـەك کـە ئادەمییـەت لـە ناوی دا گەوزاوە، بە هۆی لادانی لـە یاسـای دونیـای.. کە فێربوونی خراپ و خراپکردارێکە کە کەسانی تر لەبـەریان گرتۆتـەوە بـە سرۆشـتێك کـە خوایەکـەی سرووشـــتی کـــردووە. بـــە خـــۆم دەوت: کـــام دۆزاك"شەیتان" و نالەبارە کە ئـەوی خستۆتە سـەر ئەم رێگا و بەرەورووی ئاوا دۆزەخێکی کردووە؟
داخ و داخەکەم بەندەکان!!!

لە سێبەری قورئاندا دەمبینی، کە بوون چ لە رووی ماهیەت و راست و دروستی دەروون و چ لە رووی رووکاری دەرەوەی، زۆر لەوە گەورەترە کە تەماشا دەکرێت. چ بونێك کە بریتیە لە دونیایەکی دیار و دونیایەکی نادریار نە ئەوەی کە دونیایەکی دیار. نەخێر، بەڵکو دونیا و ئاخیرەت، نە ئەوەی کە ئەم دونیا و بەس. گەش و نومای ئادەمیەت هەم بە درێژای رۆژگار درێژ بووە و لە نێوان ئەو دوڵانەدا رۆکەوتووە. مەرگیش هەم کۆتا خاڵی ئەم کۆچەرە نییە، بەڵکو راوەستانێك لە رێگای ئەم کاروانەدایە. ئەوەی کە ئادەم لەم گۆی گەردوونەدا بە دەستی دەهێنێ، هەموو بەشی ئەو پێکدەهێنێ، بەڵکو تەنها بەشێکە لەو. هەندێکی لەم دونیادا لە دەست دەدات، بە تەواوی دەستی دەکەوێ. چ لەوێدا زوڵم و ستەم، کەم و کوڕی، بە فیڕو بە فیڕۆچوون نییە. لە روویەکی ترەوە ئەم مەنزڵگا کاروانییە کە لە رووی ئەم ئەستێرە زەوییە دەیبڕێ، بچوکێکە کە لەگەڵ دونیای زیندوو و دونیای یار و میهرەبانی، ئەوا ئەو دەپێوێ. دونیایەکی گیاندارە، کە دەبیستێ و وەڵام دەداتەوە.. روو دەکاتە پەرەستراوی تاك و تەنیا کە لە سەر تاکی باوەڕدار و بە گوێڕایەڵ و بە تەوازوع:-

(وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَنْ فِي السَّـماوَاتِ وَالأَرْضِ طَوْعًـا وَكَرْهًا وَظِلالُهُمْ بِالْغُدُوِّ وَالآصَالِ)

واتـە: وە هـەموو ئەوانـەی کـە لـە ئاسمانـەکان و زەویـدان، تەنانـەت سێبەرەکانیشـیان، بیانـەوێ و نەیانـەوێ بـەیانیان و ئێـواران، سـەرجەم ئەمانـە گشتیان سوژدە بۆ خوا دەبەن. (رعد/١٥)

(تُسَبِّحُ لَهُ السَّمَاوَاتُ السَّبْعُ وَالأَرْضُ وَمَنْ فِيهِنَّ وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إلا يُسَبِّحُ بحَمْدِهِ).

واتـە: هـەر حـەوت ئاسمانـەکان و زەوی‌ـو، هـەموو ئەوانـەش کـە تێیانـدان، هـەموو گـەورەیی و بـێ خەوشی ئەو "خوا"یە دەڵێن گەواهی بۆ یەکتای ئەو دەدەن. هـەموو شـتێك هـەر هـاواری تـاك و تـەنیایی ئـەو ئەکـەن، پاڕانـە و تەسـبیحات و حەمـدی ئـەو دەڵێن. (اسراء/٤٤)

ئـاوا بیرکردنەوەیـەکی تـەواو و راسـت و دروسـت و فـراوان سـەبارەت بـە بـوون، چ ئارامییـەك، چ سـنگفراوانیەك، چ هـاودەم و خۆشەویسـتییەك، چ دڵنیاییـەك لـە دڵـی مـرۆدا دروسـت دەکـات.. وە چ ئاوێـك دەکـات بـە ئـاگری دروونیـدا..؟ لـە سـێبەری قورئانـدا، مـرۆم وا بـە گـەورەی دەبـینی کـە لەگـەڵ پێوانەییـەکانی رابـردوو و داهـاتوو مـرۆ شـایەنی

لێکۆڵینــەوە و روونکردنــەوە نییــە.. ئــەو لەگــەڵ فووی"نەفخەی" خوای مرۆیە.

(فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِنْ رُوحِـي فَقَعُـوا لَـهُ سَاجِدِينَ).

واتە: ئینجا هەر کە بە تەواوی رێکم خست وە لە گیانی خۆم روحم بە بەرا کردوو، بوو بە مرۆڤێکی تەواو خاوەنگیان، ئێوەش"فریشتەکان" داورنەوەو دەمەو روو سوژدەی بۆ بەرن هەمووتان. (حجر/٢٩)

ئەو لەگەڵ ئەو"فوو"ە جێنشینی خوایە لە زەویدا:

(إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلائِكَةِ: إِنِّـي جَاعِـلٌ فِـي الأَرْضِ خَلِيفَةً).

ئەو کاتە وەبیر بێنە ئەی موحەممەد"صلى الله عليه و سلم" کە پەروەردگارت بە فریشتەکانی گوت: کە بەڕاستی من دەمەوێ جینشینێك لە زەویدا بۆ ئاوەدانکردنەوەی زەوی دابنێم.... (بقره/٣٠)

وە ئەوەی لە زەویدایە هەموو لە ژێر فەرمانی ئەودایە...

( وَسَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ).

واتە: هەر چی لە ئاسمانەکان و زەویدایە، هەر هەمووی خوا بە میهرەبانی خۆی بۆ ئێوەی کردووە.. (جاپیە/١٣)

لەگەڵ ئەو هەموو بەشدارییەی بەنرخ و گەورە و پلە بەرزە کە تێیدا بەشدارە کە خوای گەورە پەیوەندییەکی داناوە کە مرۆ پێویستە کۆبێتەوە لە دەوری، پەیوەندییەکی داناوە کە لە "فوو"ی گەورەی خوای گەورە پارمەتی وەرگرێ، ئەم پەیوەندییەش پەیوەندییەکی "عقیدە"ییە لەگەڵ خوا. چ عەقیدەی باوەڕدا، خاك و وڵاتی ئەوە، هۆز و گەلی ئەوە، خاو خێزانی ئەوە.. ئالێرەدایە کە مرۆ دەبێ لەرووی عەقیدەوە خۆی کۆبکاتەوە نەك لە رووی کۆبوونەوەیەك کە کە مێگەلە مەڕ و حەیواناتی چوار پێ لەسەر کۆدەبنەوە.. باوەڕدار خاوەن بن و بنەچەیەکی رەگدارە، کە رەگەکەی بۆ سەردەمانێك دەگەڕێتەوە.. ئەو تاکێکە کە پێکهاتەی ئەو کاروانەیە گەورەیە کە سەرقافڵەی سەرۆکەکانی نوح، ئیبراهیم، ئیسماعیل، ئیسحاق، یەعقوب، یوسف، موسی، عیسی و "محمد صلی الله علیه و سلم"ە.

(وَإِنَّ هَذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَأَنَا رَبُّكُمْ فَاتَّقُونِ).

ئەم کارانە گەورەیە هەر لە رۆژگارانی کۆنەوە بەردەوام لە رێگەی خۆیدا بووە، وە لە جۆرەها وڵاتان لە نیوان میللەتانێکی زۆر- هەروەك لە سێبەری قورئاندا ئاشکرایە- لەگەڵ هەلانێکی وەك و

یەك، ناخۆشیانێك و ناراحەتیانێکی وەك و یەك و، هەموو تاقیکردنەوەیەکی وەکو یەك کە روو لە روو رووپانـداوە. بـە گـومڕای، دلـکـوێری، سەرپێچـی، ئارەزوو پەرەستی، ئەزیـەت و ئـازار، زوڵم و سـتەم، تـرس و هەڕەشـە لەیـەك تـرازان و دوورکەتنـەوە.. رووبەڕووبونەوەتـــەوە، بـــەڵام لـــە ســـاحەکەدا رایانـەکردووە.. بەهـەنگاوی توونـد و یادەوەریـەکی ئـارام، لەسـەر رێگـەی خۆیـان بـەردەوام بـوون.. بـە یارمـەتی و هیـوای بـوون بـە خـوای گـەورە، روویـان کردۆتـە پێشـەوە، هـەر ئـەوانیش لەسـەر پـەیمانی راستی و دڵنیای خوای گەورە ماونەتەوە..

(وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِرُسُلِهِمْ: لَنُخْرِجَنَّكُمْ مِنْ أَرْضِنَا أَوْ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَا. فَأَوْحَى إِلَيْهِمْ رَبُّهُمْ لَنُهْلِكَنَّ الظَّالِمِينَ وَلَنُسْكِنَنَّكُمُ الأَرْضَ مِنْ بَعْدِهِمْ ذَلِكَ لِمَنْ خَافَ مَقَامِي وَخَافَ وَعِيدِ).

واتـە: وە ئەوانـەی کـە کـافر و بـێ بـاوەڕ بـوون بـە پەیامبەرەکانی خۆیان گوت: ئەمـە سوێند بێـت لـەم وڵات و سـەرزەوییەماندا دەرتـان دەکـەین یـان دەبـێ واز لـەو دینـە بێـنن، بگەڕێنـەوە بـۆ دیـن و بـاوەڕی ئێمـە، ئینجـا پـاش ئـەوە پـەروەردگاریان وەحـی بـۆ کردن و تێی گەیاندن کە بەڕاستی دەستە و بەستەی ناهـەقیکاران سـتەمکاران لـە نـاو دەبـەین، وە بـێ

گومـــانیش پـــاش لـــەناوبردنی ئەوانـــە، ئێـــوە ســـەردەخەین و لــە شـــوێنەکانیاندا نیشـــتەجێتان دەکـەین، دیـارە یارمـەتی ئـاوا و لـە نـاوبردنی ئـەو ستەمکارانە بـۆ کەسێك دەکـەین کـە لـە دەسـەڵات و پەیابـــەرزی و مـــەقامی مـــن و، لـــە هەڕەشـــەکانم دەترسێ. (ئیبراهیم۱۳-۱۴).

بارودۆخ، ئەزموون، هەڕەشە، دڵنیای و، پەیمانێکە بۆ ئەم کاروانە پیرۆز و گەورەیە.. وە تاکێکە لە کۆتـای گەڕانەکـەی، چاوەڕوانی دەکـەن و بـۆ گەیشتن پێـی ئەو ئەزیـەت و ئـازار و ، هەڕەشـە و ترسـە بـە گیـان دەیکڕن.

لە سێبەری قورئاندا فێـر بـووم کـە لـەم جیهانـە بـێ پەرەدا، بێ بارە ئەو وتەیە" لە خۆوە دروست بـوو و کوێرکوێرانە" کە جێگای باوەڕە:

(إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ)...

بەڕاسـتی ئێمــە هـــەموو شـــتێکمان بـــە ئەنـــدازەی دیاریکراو درووستکردووە. (قەمر/۴۹)

(وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا).

هـەموو شـتێکی لـە نـەبوون و "عـەدەم"ەوە دروسـت کـردوو بـەدی هێنـاوە، نـەك هـەر ئەوەنـدەش بـەڵکو تـــەکبیر و ئەنـــدازەگیری تەواویشـــی بـــۆ کـــرد .. (فرقان/۲)

هەر ئیشێك حیكمەتێكی هەیە، تێگەیشتنێكی شاراوە لەبەر چاوان، چ بگات بە رووكەشە نیگایەك..

(فَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئًا وَيَجْعَلَ اللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا).

چونكە گەلێ شتی وا هەیە ئێوە خۆشتان لێ نایە كەچی خوا خێر و چاكەیەكی زۆری تیا داناوە.. (نیسائ/١٩)

(وَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ وَعَسَى أَنْ تُحِبُّوا شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَكُمْ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لا تَعْلَمُونَ).

لەوانەیشە لە شتێك حەز نەكەن و ناخۆش بێت لاتان، بەلآم خێر و چاكەی تێیدا بێت و بەخێرش گەڕێ، رەنگە حەزتان لە هەنێ شت بێ و پێشتان خۆش بێت كەچی شەڕ و خراپ بێت و ئاكامەكەی باش نەبێ، بێ گومان خوا خۆی ئەزانێ چ شتێ چاكە و چ شتێ خراپە، بەلآم ئێوە نازانن (بقره/٢١٦)

هۆكارێك كە كۆمەڵەی خەڵكی كە عادەتیان پێ كردوو و شارەزا بوون پێی، هەندێجار ئامانجی دەبێت و هەندێجاریش ئامانجی نادات بەدەستەوە. پێشەكیانێك كە خەڵكی بە مسۆگەری دەزانن، هەندێ جار ئەنجامەكانیان بە دوایاندا بێت یان نەیەت. ئەمەش بەو شێوەیە كە ئامراز و پێشەكی،

شتانێك نین كە شوێنەوار و ئەنجام بێنە بوون و بیكەنە دیاردە، بەڵكو داهێنەرانە هەمان ویستی بێ سنوورە كە شوێنەوار و ئەنجام دادەهێنن و وە هەمان شێوە كە خودی ئامراز و پێشەكیانێكی داهێناوە:

(لا تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَلِكَ أَمْرًا).

واتە: تۆ چووزانی دوای تەلاق دانەكەی چی دەبێت؟ لەوانەیە خوای كارزان كارێ تازەش پێشبینێت. (تەلاق/ ١)

(وَمَا تَشَاءُونَ إِلا أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ).

وە هیچ شتێك لەم شتانە ئارەزوو ناكەن، مەگەر ویستی خوای لە سەر بێت. (انسان/ ٣٠)

بەڵام كەسی ئیماندار دەبێ لەو هۆیانە سوود وەرگرێ كە بوونی هەیە، چونكە بۆ بەكارهێنانی و سوود وەرگرتنی فەرمان دراوە. تەنها خوای گەورەیە كە شوێنەوار و ئامانجی ئەوانەی داناوە.. وە هەر ئەویشە كە روونی دەكاتەوە. دڵنیابوون بە بەزەی خوا و دادپەروەری و زانای و زانستی ئەو، تەنها پەناگەیەكە كە شوێنی ئەمن و ئەمانە.. وە تەنها شوێنێكە كە دڵ تێیدا ئارام دەگرێت و لە دوودڵی و دڵەڕاوكێ بە دوور دەبێت:

(الشَّيْطَانُ يَعِدُكُمُ الْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُمْ بِالْفَحْشَاءِ وَاللَّهُ يَعِدُكُمْ مَغْفِرَةً مِنْهُ وَفَضْلا وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ)

لە كاتی بەخشیندا شەیتان بەڵێنی هەژاری و نەداریتان پێ دەدا و پێتان ئەڵێت: ئەگەر ببەخشن لات و هەژار ئەكەون! هێمان بۆ كاری ناشیاویش وەك"رژدی و چرووكی" وە نەبەخشین و هەر تاوانێكی تر هەڵتان ئەنێت. خواش بەڵێنی فەزڵ و بەهرەی خۆیتان پێ ئەدا، خوا خاوەنی نیعمەتێكی فراوانەو، زۆر زانا و بە ئاگایە بە هەموو كردار و نیازێكتان. (بقره/٢٦٨)

بە دوای ئەو لە سایەی قورئاندا بە یادوورییەكی ئارام و ناخێكی ئارام و دڵێكی رۆشن بە ژیان بەردەوامیم دەدا و دەستی خوای گەورە لە هەر كارێك و لە هەر فرمانێكدا دەبینی و وە لە سێبەری پارێزراوی پەروەردگار و لە ژێر چاودێریكاری خوداوەندێك بەسەرم دەبرد.. سیفات و ناوی پیرۆزی و جێ بەجێكاریەكانم دەست كەوت..

(أَمَّنْ يُجِيبُ الْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ السُّوءَ)

یا خۆ كێیە وەلاَمی هاوار و نزای لێقەوما و داما و ناچار و هەژار دەداتەوە، كەبەهانا هاتنی لێ بكا و، هانای پێ ببات، ئەو بەلاَو ناخۆشیە لادەدات كە لە سەر شانیانە. (نمل/٦٢)

(وَهُوَ الْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِ وَهُوَ الْحَكِيمُ الْخَبِيرُ)

هەر خۆشیەتی زاڵ و دەست ڕۆیشت و بەسەر هەموو عەبدەکانیدا، هەر ئەویشە لە کارزان و کارجوان و بە ئاگایە بە کاروباری بەندەکانی. (انعام/١٨)

(وَاللَّهُ غَالِبٌ عَلَى أَمْرِهِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لا يَعْلَمُونَ)

خوای گەورەش بەسەر گشت کارەکانی خۆیدا زاڵ و بەدەسەلاتە، بەلام زۆربەی خەڵکی ئەمە نازانن و، لە حیکمەتی کارەکانی تێ ناگەن. (یوسف/٢١)

(وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يَحُولُ بَيْنَ الْمَرْءِ وَقَلْبِهِ)

چاکیش بزانن کە بێ گومان خوا دەتوانێ لە نێوان مرۆڤ و دڵیدا لەمپەر دانێ و، نەهێڵێت تووشی هیچ خێر و چاکەیەك ببێت بۆیە مرۆڤ دەبێ هەمیشە لە خوا بترسێ و خۆی بداتە دەست ئەو... (انفال/٢٤)

(فعال لِمَا يُرِيدُ)

بەڕاستی پەروەردگاریشت زۆر بە دەسەلاتە، بیەوێ هەر شتێك بکات دەیکات وە هیچ بەرگرێکی بۆ نابێت. (هود/١٠٧)

(وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَلْ لَهُ مَخْرَجًا وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لا يَحْتَسِبُ وَمَنْ يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ إِنَّ اللَّهَ بَالِغُ أَمْرِهِ)

هەر کەسێك لە خوا بترسێ و سنوورەکانی بپارێزی، خـوا دەرووی خێـری لـێ دەکاتـەوە وە رزق و رۆزی دەداتێ لە شوێنێکەوە کە خۆیشی گومـانی نـەدەبرد. وە هەرکەسـێك پشـت بـە خـوا ببەسـتێ دوای بـەکارهێنانی هۆکـار، ئـەوە تـەنیا خـوای بەسـە و کاروباری بۆ ئاسان دەکات، چونکە بێ گومان هەرچی خـوا بڕیـاری لەسـەر بێـت ، هـەر ئـەنجامی دەدا و دەیگەیەنێتە جێ... (تەلاق/٣و٢)

(مَا مِنْ دَابَّةٍ إِلا هُوَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهَا)

هـیچ دەعبـا و ڕەوکـەرێك نییـە مەگـەر خـوا پێشـە سەری گرتووە. (هود/٥٦)

(أَلَيْسَ اللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُ وَيُخَوِّفُونَكَ بِالَّذِينَ مِنْ دُونِهِ)

ئایا ئەی پێغەمبەر! هەر خوا بەس نییە بۆ بەنـدەی خۆی(موحەممـەد) لـە کـاتی هـەموو خۆشـی و ناخۆشـیەکەدا؟ وە هاوبەشـدانەران بـە جگـە لـە خوا"بە بتەکان" دەترسێنن! (زمر/٣٦)

(وَمَنْ يُهِنِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ مُكْرِمٍ)

خـوا هەرکەسـێك بـێ ڕێـز و سـووکی بکات"بـە هـۆی لاساری خۆیەوە" ئیتر هیچ کەسێك ناتوانێ ڕێزی لێ بنێت و بەرەو بەختیاری بهێنێتەوە. (حج/١٨)

(وَمَنْ يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ)

وە هەرکەسێك خوا گومڕای بکا، بە هۆی کەللە ڕەقی خۆیــەوە، ئــیتر هــیچ ڕێ نیشــاندەرێکی بــۆ نــابێ، کەسێکی تر ناتوانێ ئیمانی لا شیرین بکا و، باوەڕی پێ بهێنێت. (رعد/٣٣)
هەروەها ئەوەش فێربووم کە دەستی خوای گەورە لە ئیشــدایە و، لــە ڕێگەیــەکی تایبــەتی خــۆی بــەکاری دەهێنێ. ئێمە مــافی ئــەوەمان نییــە کــە داوا لــە خــوا بکەین کە کاروبارەکان بە هەرچی خێراییــە بچێتە پێشــەوە و ئەنجامەکەشــیمان پــێ نیشــان بــدات. هەروەها مافی ئەوەمان نییە کە خۆمان لە کاروباری خوای گەورەدا هەڵقورتێنین و نابێ بۆ خــوای گــەورە پلان دابنێین و نەخشەی بـۆ دابڕێـژین و ڕیگـای پـێ نیشان بدەین، چونکە- لە سایەی قورئاندا ئاشکرایە- شــەریعەتی خــوای گــەورە دانــراوە تــا لــە هــەر ناوچەیەك و هەر هەنگاوێك لە هـەنگاوەکانی گـەورە بــوونی مــرۆی و لــە هــەر یــەك لــە بــارودۆخی بەردەوامی کە لە یەك هەیکەل و ڕەگـەزێکن. یاسـای خوای بۆ ئەو مرۆیەی کە لەسەر ئـەم زەویـە خاکیـە کــە ژیــان بەســەر دەبــات دانــراوە، لەوەشــدا نــرخــی سروشــتی مــرۆ و نــرخــی هێــز و توانــا و لێهــاتووی و دەســـەڵات و لاوازی و حاڵـــەتی جۆراوجـــۆر کـــە بەسەریدا دێت و تووش دەبێت، لە ڕاوێـژ بـە دووری

گرتووە و حسابی گرنگی دانی بۆ کردووە. خوای گەورە سەبارەت بەم بوونە کە مرۆیە بەدگومان نابێت تا هەل و دەرفەت و ئیشی ئەو لە زەویدا بە گومانەوە تەماشا نەکات یان لە شێوەیەك لە شێووەکانی ژیانی-یان لەکاتی تەنیای یان بە ناونیشانی ئەندامێك لە هەیکەلی کۆمەلگە- نرخی ئەو نەزانێ. هەروەها خوای گەورە بەدوای خەیاڵدا ناگەڕێ تا لەکاتی بەئاگانەبووندا، تا ئەم بوونەوەرە بەرزتر لە مەنزلگایەك کە هەیەتی جێگای بکاتەوە یان زیاتر لە توانای خۆی و ئەو ئیشەی خۆی زیاتر داوای لێبکات، بەڵکو رچاوی هەموو سروشتێکی مرۆی خواپێدراوانەی کردووە، سروشتێك کە لە رۆژی یەکەمەوە لەسەر ئەو سروشتە و لەگەڵ ئەو سروشتە ناردوویەتی بۆ ئەم دنیایە.. لە هەردوو حاڵەتەکەدا.. تاکی و کۆمەلگەی، پایەکانی فیترەت و بنەماکانی سروشتی ئەومندە رووکاری و ئاسان نییە تا لەگەڵ ئەو یاسا دانراوەدا رێك بکەوێ لەگەڵ ئیشارەت کردن بە پینوسێك بدروەشێتەوە.. مرۆ هەمان ئەو دیاردەیەیە بە بوونی هەمان سروشت و ئارەزووەکان و ویستەکان، هێز و تواناکان، ئاینی پەروەردگار دەستی دەگرێ و تا بە رووی بەرزترین پلە تەواو کە لەسەر حسابی سروشت و ئەو ئەرکەی

بۆ دانـراوە بـەرزی بکاتـەوە. هەیکـەل و سروشـت و گورخی"پتەوی" ژیانی لـە ڕێگایـەکی تـەواو کـە ڕوو بە خوای هەیە، ڕێزی دەگرێت و چون ئاینی خـوای بۆ ڕۆژگارێکی درێژ- ماوەیەك کە تەنها دروسـتکراوی ئەم مرۆیە وە نێرەری ئەم قورئانە، کە پێ شارەزایە و دەیناسـێ- دانـراوە، لـە بـەر ئـەوە بـۆ بـەدیهێنانی ئامانجـانێکی گـەورەو و خۆشەویسـت لـە ڕێگەیـە کـە ڕێگاکەی بەرەو ڕووی خوایە، نە بەتاو"بەلەز" بـووە و نە لادراوی بووە. لـە ڕووبەڕوویـدا کـاتێکی دوور و درێژە کە نە تەمـەنی کەسـێك سـنوور و کۆتایەکـەی دەزانرێ، وە نە خواستانێك و خواستی تایبەتی - کـە دەترسـێ مـردن ئـەو لـە گەیانـدنی بـۆ کۆتـای بـێ سنووورێك ڕایگرێ- چەرخی زەمانە خێراتر بکـات و هـەروەك لایـەنگرانی ڕێبـاز و نامەنووسـانی زەوینـی تووشـــی ئــەم دڵـەڕاوکێی و بەپەلەیـــەن و یاســـای تایبــەتی بـــە قوتابخانـــەی خـــۆی تـــەنها بـــۆ یـــەك جیل"نـەوە" بـەکاری دێـنن وە دەسـتبەجێ بـە دوای هەلێکی بەسوودی زووگرن، وە چون تاقەت و توانـای هەلگرتنی هەنگاوانی ئارام و ڕێـك و پێکـی نییـە لـە هاودەنگی و هاوکاری لەگەڵ سروشـــــــــــت هاوئاهـەنگ دوورە پـەرێزی دەکات و لـەم ڕێگـە لارو بـێ خۆگریـە کـە دەیپـوون، کوشـتن و کوشـتارگەکان

سەرهەڵدەدەن و خوێنیش ڕێ دەكات و نرخی و پێزانینی هەست و شعور تێكدەچێت. وە كردەوە باش و جوانەكان دڵخورپە و دڵەڕاوكی و تووشی پشێوی دەبن، لە كۆتایدا خۆشیان تێكدەشكێن و نووسەرە"نامەنووسە" ساختەكارەكانیان، دەكەونە ژێر پیكی"چەكوشی" فیتڕەت كە دۆخی لادراوی لەسەر نییە و توانای خۆ دانە پاڵی پێوە نییە. لوول و خوار و خێچ دەبن. بەلآم ئیسلام لەسەرەخۆ و ئارام لەگەڵ سروشت هاوهەنگاو"یەكگر" دەبێت، هەندێ جار لێرەوە دەیباتە ئەوێ و لەوێ رایدەگرێ، وە چون لە رێگەی راست، لابدات، ئەوا رێنوینی دەكات و دەیخاتە سەر راستە رێگا"سیراتەلموستەقیم"، بەلآم ئەو لە ناو نابات و لێكی ناكاتەوە، بەڵكو لەگەڵیدا لەسەرەخۆ دەبێت و، وەكو كەسێكی باش و دڵبەئاگا، كردەوە جوان كە پێشاوپێشی رێگا و پلانی ئامانجی خۆی دروست كردبێت، لەگەڵیدا لەسەر خۆی دەنوێنێ و رێنوینی دەكات.. ئیسلام دەزانێت ئەوەی لەم دەورە"خولە" كامڵ و تەواو نەبێت، لە خولی دووەم یا سێ یەم یا دەیەم یا سەدەم یا هەزارەم، .. تەواوی بكات، چونكە رۆژگاری درێژ و ئامانجی روونكە، وە رێگای گەیشتن بە ئامانجی گرنگ و گەورە هەم درێژ دەبێت،

هـــەروەك چـــۆن درەختێكـــی گـــەورە دەڕوێـــت و ڕەگەكانی خۆی لە دڵی زەویدا دادەچـەقێنێ و وە لـق و پۆپـــەكانی سەرســـەوزو پـــڕ و گـــەش دەبێـــت، ئیســلامیش هــەروەتر دەڕوێــت و لەســەرخۆ و بــە ئارامی بالآ دەكات و بـە سادەی دەچێتە پێش و بـە یادەوەریـەكی ئاسـودە، سـەربەرز دەكاتـەوە و گـەردن بەرزانە دەڕوانێت، سـەرەنجام"لەكۆتایدا" هـەر ئـەوە دەبێـت كـە ویستی خـوای گـەورەی و ویسـتی ئـەو دەبێـــت.. هەنـــدێ جـــار تـــۆ و لەگـــەڵ هـــەڵكردنی تۆفانانێـك لـە ژێـر سووچـی لـین دەشــاردێتەوە و هەنـدێ جـار كرمـەخۆرە پەیـدا دەكـات، وە چ بكـات بەوەی كە توونیبوونی تۆوەكە بـە نیمچـە سووتاوی دەمێنێتەوە، وە زەمانێـك سێلآوەكان دەیخەنـە ژێـر، بەلآم جوتیار بینـەر و دووربـین دەزانـێ كـە تۆوەكـە ماوەتـــــەوە و لـــــە كۆتایـــــدا لـــــە لابـــــەلای چینێك"كۆمەڵەیەك" دەردەچێت و سـەردەردەكا و، وە بـۆ ماوەیـەكی درێـژ لەسـەر ئـەم هـەموو بەلآیـە دەڕوانێت.

بۆیـە نـە دەكەوێتـە هەڵپـە و نـە ڕێگـاش دەدات ناڕاحـەتی و دڵـەڕاوكێی رووی تێبكـات. بـەڵكۆ بـۆ سوود گەیاندن و سوودوەرگرتن لێـی، جگـە لـە هـۆی سروشـتی و سروشـتە نـەرم و ئـارام، وە هاوهـەنگا و

هـــاودەنگ و بەخشـــەندە و میهرەبـــان، ســـوود وەرناگرێ.. وە ئەوەش هەمان سوونەتی ئیلاهیە کە لە شارەگی هەموو بوونەوەر و رەوانە.
(وَلَنْ تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلا).

هەرگیز تـۆ گۆڕانکاریـت دەسـت ناکـەوێ لـە بـاوو بڕیارەکـــانی خـــوادا. (احـــزاب/٦٢، فـــاتیر/٤٣، فتح/٢٣)

حق"مـاف" لـە ئـاینی خـوای و لـە بینـای بوونـدا، شـــتێکی رەســـەنە. ئـــەوەش نـــەك ئاڕاســـتەیەکی زووتێپـــەڕ و زووگـــەڕ، وە نـــە پێشـــهاتێکی بـــێ چـاوەڕوانی و بـێ ئاڕاسـتەیە. بـەڵکو پـەروەردگاری پایەبەرز حەقە و بەس، وە لـە زاتـی گەورەیـدا هـەر بوونێك رازێنەیەکی لەبەردەکا:
(ذَلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِـــنْ دُونِـــهِ الْبَاطِلُ وَأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ).

ئەمەش بەو هۆیەوەیە کە تەنیا خـوا، پـەروەردگاری راســـتەقینەیەو پایەبـــەرز و گەورەیـــە و، وە خوایەکانی تر پووچن.

نیشاندانی ئەو ئاڵوگوڕ و دەسـەڵاتە هـەر بـۆ ئەوەیـە ئێوە دڵنیابن کە هەر ئەو خوایـە راسـتە، بـێ گومـان ئەوەی دەیپەرەستن جگە لە خوا ناڕەواو پوچەڵە، وە بێ گومان ئەو خوایە بڵند و گەورەیە.. (لقمان/٣٠)

خـــــواى گـــــەورە ئـــــەم دونيايـــــەى لەســـــەر ئەساس"بنەڕەت"ى حەق دروست كردووە و لەگەڵ ئەو باتڵ و پووچانە تێكەڵ نابێت.

(مَا خَلَقَ اللَّهُ ذَلِكَ إِلا بِالْحَقِّ).

بێ گومانيش خواى كار دروست ئەو خۆر و مانگەى بێهوودە دروست نەكردووە، بەڵكو بە هەق و دروست بەديهێناوە.. (يونس/٥)

(رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذَا بَاطِلا سُبْحَانَكَ).

ئـــەى پـــەروەردگارى ئێمـــە! هـــەرگيز تـــۆ ئـــەم دروستكراوە پڕ لە وردەكارييەت بێهودەو بێ ئامانج دروست نەكردووە، تۆ لە هەموو ناتەواوييەك پاك رائەگرين دەسا تۆيش لە سزاى ئاگر بمانپارێزە. (ال عمران/191 )

(وَلَوِ اتَّبَعَ الْحَقُّ أَهْـــوَاءَهُمْ لَفَسَـــدَتِ السَّـــمَاوَاتُ وَالأَرْضُ وَمَنْ فِيهِنَّ).

واتـــە: ئەگـــەر هـــەق و راســـتى خـــوا دواى هـــەوا و ئارەزووى ئەوان كەوتبا، چۆنيان پێ خۆشبا هەق ئاوا بووبا، بێ گومان ئێستا سيستمى ئاسمانەكان و زەوى و هـــەر دروســـتكراوێكى تـــريش تێياياندايـــە دەشێواو تێك دەچوو، چونكە بوونـەوەر لەسـەر بناغـــــەى دادپـــــەروەرى و دادگـــــــەرى دامەزراوە...(مومنون/٧١)

حەق بە ناچاری دەبێ ئاشکرا بکرێت و سەرکەوت و کارامە دەبێت، وە باتڵیش دەبێ شکست بخوات و لە مەیدان دەرکرێت..ئەگەر رووی فرمانەکە جگە لەمە بێت، لە کۆتایدا هەر وا دەبێت و سەرکەوتنی حەق مسۆگەر دەبێت:

(بَلْ نَقْذِفُ بِالْحَقِّ عَلَى الْبَاطِلِ فَيَدْمَغُهُ فَإِذَا هُوَ زَاهِقٌ).

نا ئەوە دەستووری ئێمە نییە: بەڵکو ئێمە دەمانەوێ بە هەق باتڵ بکوتین و داغانی بکەین و لە ریشەی بکێشین.. (ئەنبیا/١٨)

خێر و چاکە و باشە چونکە وەك حەق رەسەنن، و وەکو زەوی دەمێنێتەوە:

(أَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَسَالَتْ أَوْدِيَةٌ بِقَدَرِهَا فَاحْتَمَلَ السَّيْلُ زَبَدًا رَابِيًا وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيْهِ فِي النَّارِ ابْتِغَاءَ حِلْيَةٍ أَوْ مَتَاعٍ زَبَدٌ مِثْلُهُ كَذَلِكَ يَضْرِبُ اللَّهُ الْحَقَّ وَالْبَاطِلَ فَأَمَّا الزَّبَدُ فَيَذْهَبُ جُفَاءً وَأَمَّا مَا يَنْفَعُ النَّاسَ فَيَمْكُثُ فِي الأَرْضِ كَذَلِكَ يَضْرِبُ اللَّهُ الأَمْثَالَ).

واتە: ئەو خوایە لە ئاسمانەوە ئاوو بارانێکی باراند ئینجا هەر شیو و دۆڵێکی پڕاوپڕ بارستایی خۆی باران کرد و لافاوی لێ پەیدا بوو، ئەوجا ئەو سیلاو و لافاوە پووش و پەلاش و کەفێکی زۆری لەگەڵ

خۆیدا هەڵگرت وە لێ جیابووەوەو، ئاوەکەش بەڕوونی دەرکەوت، وە هەروا نمونەو مەسەلێکی زۆر دێنێتەوە بەو کانزانەی وەك"زێڕ و زیو و ئاسن و مس" کە لەسەر ئاگر دەتوێنرێنەوە بە مەبەستی پالاوتن و وەدەستهێنانی کەرەستەی جوان و خشلێك، یان بە مەبەستی درووستکردنی هەر شتێکی تر کە دەبێتە هۆی ژیان و ژێوار.. بەو شێوەیە خوا مەسەل و نمونە بۆ هەق و باتڵ، دێنێتەوەو لێکیان جیادەکاتەوە، جا کەف کوڵەکە لە ناو دەچێ و دەڕواو فڕێ دەدرێت، چونکە هیچ قازانج و خێرێکی تیا نابێت، بەلام ئەوەی کە بەهرە و کەڵك بە خەڵك دەگەیەنێت، وەکو ئاوەکە، یان وەکو مەودای فلزی و کانزای لە زەویدا دەمێنێتەوەو بەرقەرار دەبێ، خوا بەو شێوەیە نمونە دێنێتەوە بۆ ئیمان و باوەڕ، بۆ کوفر و بێ بڕوای... (رەعد/١٧)

(أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلا كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِي السَّمَاءِ تُؤْتِي أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍ بِإِذْنِ رَبِّهَا وَيَضْرِبُ اللَّهُ الأَمْثَالَ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ وَمَثَلُ كَلِمَةٍ خَبِيثَةٍ كَشَجَرَةٍ خَبِيثَةٍ اجْتُثَّتْ مِنْ فَوْقِ الأَرْضِ مَا لَهَا مِنْ قَرَارٍ يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ

آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِـرَةِ وَيُضِلُّ اللَّهُ الظَّالِمِينَ وَيَفْعَلُ اللَّهُ مَا يَشَاءُ).

ئەرێ تۆ نازانی کە خوا چۆن مەسەل و نمونە دێنێتەوە بۆ وشەیەکی پاك و خێردار و سوودبەخش کە ریشە و رەگی لە نێو زەویدا جێگیر بووبێ و لق و پۆپەکەشی چووبێ بە ئاسماندا هەموو کاتێ کە کات خۆی هات بەرو میوەجاتەکەی بە فەرمانی پەروەردگاری خۆی دەدا، وە خوا"جل جلالە" وێنە و نمونەی وردو و سوودبەخش دێنێتەوە بۆ خەلکی تا بەشکو بیربکەنەوە و عیبرەت و پەند بگرن.. ئەوجا نموونەی وشەی پیس و ناپاك و بێ خێر و بەرەکەت"شیرك" وەکو درەختێکی پیس و ناپاك و بێ سوودە بە ریشکەوە هەلکێشرابێ و لە سەر زەوی فڕی درابێ، مانەوەو قەراری نەبێ، جا شیرك و بێ باوەڕیش هەرچەندە کێو و دەشت و دەریاکان پڕ بکا و بیکاتە هەراو هۆسە، بەو درەختە پیسەیە دەچێ کە بە ریشکەوە هەلکێشراوەو فڕی دراوەتە سەر زەوی و ناجیگیرە، چونکە هیچ ئەسلْ و بنەمایەکی نییە کە بەلگەی ژیری و زانستی پشتگیری لێ بکا، جا ئەوانەی کە باوەڕیان بە خواو بە گشت بڕیارەکانی خوا هێناوە، بە هۆی ئەم وشەی جێگیر و نەگۆڕاوەی" لا اله الا الله" وە خوا پێگەیان

قايم و سابت ئەكا لە ژيانی ئەم دونيا و لە ژيانی ئەو دونيا و ستەمكارانيش گومڕا و سەر لێشێواو دەكات خوا بيەوێ هەر شتێك بكات، زۆر بە ئاسانی دەيكات...(ئيبراهيم/٢٤-٢٧)

ئايا ئەو جۆرە بيركردنەوە چ باوەڕێك و دڵنياييەك دەهێنێتە بوون؟ چ ئارامی و سكونايەتێك دەگەيەنێت بە دڵ؟ چ ئيمان و باوەڕێك سەبارەت بە حەق و خێر و چاكە دەهێنێتە بوون؟.. وە ئەم راستيە بچووكە چ هێز و موسەيتەربوونێك لە دەروون و چ توانايەكی دڵی بە مرۆ دەگەيەنێت و دەهێنێتە بوون؟ لە ژێر سايەی قورئان، لەم قۆناغەی ژيان رۆشتووە و پێ بە هەنگاوی باوەڕی راستەقينە و باوەڕی نەگۆڕ ناوە.. وە دڵنيا بووم كە هيچ جۆرە چاكەيەك و بۆ دانيشتوانی ئەم سەرزەوييە و هيچ ئەمن و ئاسايشێك بەشی ئەم ئادەميەتە نابێت و پێشكەوتن و بەرزی و بەرەكەت و پاكی و هاوهەنگاوی و هاودەنگی لەگەڵ ياسای دونيای و سروشتی ژيان.. بە دەست نايەت مەگەر بە گەڕانەوە بۆ لای خوای گەورە.

گەڕانەوە بۆ لای خوا-بەو شێوەی كە لە قورئاندا هاتووە- يەك شكڵ و يەك رێگا زياتر نييە، تەنها يەك رێگا نەك زياتر، وە ئەو گەڕانەوەش بۆ هەموو

کاروباری ژیان. بە ئایینی خوای بەرنامەی خوایە کە پێداگریەکەی خوای گەورە لە کتێبەکەی خۆی قورئانی پیرۆز روونی کردۆتەوە.
وە ئەوەی کە ئادەمیەت لە ژیانی خۆی، تەنها ئەو کتێبە بکاتە دەستووری خۆی، وە لە کاروباری خۆی دادی"دادڤانی" تەنها بۆ پێش ئەو بەرێت. بێجگە لەم حاڵەتە، جگە لە فەساد لەسەر زەوی و بەدبەختی خەڵکی و راوەستاو لە چڵکاوی رەشی خەست و فەرمانبەرداری نەفامی، نابێت و وە لە جێگای خوا پەرستی ئارەززو پەرەستی برەوی دەبێت:
(فَإِنْ لَمْ يَسْتَجِيبُوا لَكَ فَاعْلَمْ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهْوَاءَهُمْ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ اتَّبَعَ هَوَاهُ بِغَيْرِ هُدًى مِنَ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ لا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ).
خۆ ئەگەر وەڵامیان نەدایتەوە تەیانتوانی نامەیەکی تر بێنن ئەوە بزانە کە ئەوانە هەر پەیڕەوی لە ئارەزووی خۆیان ئەکەن چ کەسێ گومڕاترە لەو کەسەی پەیڕەوی هەواو ئارەزووی خۆی کردووە، بێ ئەوەی هیچ رێنوێنێکی لە خواوە هەبێ..؟ بەڕاستی خواش رێنوینی گەڵ ستەمکاران ناکات. ( قەسەس/ ٥٠)

دادڤانی بردن بۆ ئایینی پەروەردگاری، کە لە کتێبەکەیدا قورئان یاساکان باسکراوە، نە"سنت"ەوە نە"مستحب" و نە شوێنی هەڵبژاردنە، بەڵکو پەیڕەی کردن لە یاسای ئەم ئایینە، ئیمانە و پەیڕەوی نەکردنی لێ ی بێ ئیمانیە

(وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَنْ يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ...).

بۆ هیچ پیا و ژنێکی بڕوادار نییە کاتێ خوا و پەیامبەرەکەی بڕیاری کارێکیان دا سەرپرشتککرانیان بۆ هەبێ لە کارەکەیاندا.. (ئەحزاب/ ٣٦)

(ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَى شَرِيعَةٍ مِنَ الْأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ إِنَّهُمْ لَنْ يُغْنُوا عَنْكَ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا وَإِنَّ الظَّالِمِينَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ وَاللَّهُ وَلِيُّ الْمُتَّقِينَ).

لەپاش کێشەی خاوەن نامەکان، ئێمە ئەتۆمان خستە سەر بەرنامەو شەریعەتێك لە ئایین، جا تۆش شوێنی بکەوە و بە پوختی پەیرەوی بکە، شوێن هەواو هەوس و ئارەزووی ئەو نەزانانە مەکەوە، بێ گومان ئەوانە هیچ شتێك لە خواوە لە تۆ دوورناخەنەوە، ئەگەر شوێنیان بکەویت، کەوابوو

هـيچ كـات تاڵەموويـەك لـە شـەريعەتەكەی خـوا لا نەدەيت، بێ گومان ستەمكاران بە شيرك، يار و ياوەر يـەكترن لـە دونيـادا وە پەرەسـتراوی هەقيش"اللـە" يـارو دۆسـتی پارێزگارانـە و سەرپەرەشـتی هـەموو كارێكيان ئەكات (جاسيه/١٨،١٩)

..بۆيـە ئيشـەكە زۆر جدييـە.. ئيشـە ئەساسـيەكە عەقيدەيـە.. ئيشـەكە ئەوەيـە كـە پەيوەنـدی بـە خۆشـبەختی و بەدبـەختی ئـەم ئادەميەتـە هەيـە و دانـراوە. ئـەم ئادەميەتـە -كـە دروسـتكراوی خوايـە- قوفڵـەكانی سروشـتی جگـە لـەوە كـە بـە كليلـە دروسـتكراوەكانی خـوا ناكرێتـەوە و، نەخۆشـيەكانی كەم نابێتەوە و ئازارەكانی ئارام نابنەوە و مەگەر بە دەرمانێك كە لە لايەن خوای گەورە دەست بكـەوێت. پەروەردگار كليلی هەر دەرگايەكی داخراو و دەرمانی هەر نەخۆشيەك تەنها بە پەيڕەوی كـردن لـە ئاينی خوای گەورە دەست دەكەوێت:

(وَنُنَزِّلُ مِـنَ الْقُـرْآنِ مَـا هُـوَ شِـفَاءٌ وَرَحْمَـةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ....).

ئێمـە لـەم قورئانـەدا بـۆ تۆمـان نـاردووە ئـەی موحەممـە صـلی الله عليـە و سـلم گـەلێ ئايـەت و سـورەت دادەبـەزێنين كـە مايـەی شـيفا و چـاكبوونەوەيە لـە نەخۆشـی، نـەفامی، گـومڕايی و

سەرلێشـێواوی دڵـەکان، رەحمـەت و بـەزەیی و میهرەبانیشه بۆ خەڵکی بڕوادار.. (ئیسراء/٨٢)
(إِنَّ هَٰذَا الْقُرْآنَ يَهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ....).
بـێ گومـان ئـەم قورئانـە بۆمـان نـاردوون، رێگـا و بەرنامەیەکی وا نیشانی خەڵکی دەدا، کە راسـترین بەرنامە و رێگایە..( ئیسراء/٩).
بەڵام ئەم ئادەمیەتـە نایـەوێ کە قوفڵ بباتـە پـێش دروسـتکەرەکەی و نەخۆشـیش بباتـە پـێش وەدیهێنـەری، سـەبارەت بـە کاروبـاری خـۆی و کـارە مرۆیـەکان و وە خۆشـبەختی و بـەدختی خـۆی، نایـەوێ هـەمان ئـەو رێگـا بگرێتـە بـەر کـە لـەبارەی کاروباری دەستگاکان و ئالەتی ماددی هیچ و بێ نـرخ کە لە پێویستییەکانی رۆژانەی بچووکی ئەوا سوودی لـێ وەردەگـرێ، خسـتویەتێ پـێش و خـووی پێـوە گرتووە.
چ ئادەمیەت دەزانێ کە بۆ دووبارە دروستکردنەوە و ئیشپێکردنی فلان دەسـتگا، دەبـێ لـە ئەنـدازیارێکی کارگەیـەك بـانگ بکرێـت کـە ئـەو دەسـتگای دروسـت کـردووە، بـەڵام ئـەم رێسـا و بنەمایـە لەسـەر خـودی مـرۆ جـێ بـەجێ نابێـت، تـا مـرۆ بگەڕێنێتـەوە بـۆ کارگەیەك کە لێوەی هاتووە و جگە لە پـەروەردگاری رازێنـەر دەسـتوور وەرنـەگرێت و فـەرمانی تـر قبوڵ

نـەكات كـە ئـەم دەسـتگا سەرسـوڕهێنەری بـەدی هێنـاوە، دەسـتگایەكی سەرسـوڕهێنەر و گـەورەو بـەنرخ و دەوڵەمەنـد و وردەكـاری هەیكـەلی مـرۆ، دەسـتگایەك كـە رێگـای نـاو و دەرەوەی نـازانێ جگـە لەوەی كە دروست و پەروەردەی كردووە:

(إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ أَلا يَعْلَمُ مَنْ خَلَـقَ وَهُـوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ...).

بەڕاستی ئەو بە هەموو نهێنی نێو دڵ و سینەكان زانایـە، مەگـەر خـوا نـازانێ كێـی دروسـت كـردووەو چۆنی دروست كردووە، لە كاتێكدا زۆر وردبین و بە ئاگایە؟

بەدبـەختی ئادەمیـەتی گـومڕا لێـرەدا بـووە. ئادەمیـەتی بێچـارە و سـەرگەردانێك كـە لـە رووی پێشـكەوتن و بـەرزی و هیدایـەت و ئاسـوودە و خۆشبەخت نابینێت مەگەر ئەوەی كە سروشتی مرۆ بگەڕێنێتـەوە بـۆ دروسـتكراوی گـەورە. هـەر وەك ئەوەی كە دەستگایەكی هیچ و بێ نـرخ بباتـە پـێش دروستكراوی بچوكی و بۆی بگەڕێنێتەوە.

لاوەبردنـی ئیسـلام لـە پلـەی پێشـەوای و فرمـانی رابـەری ئادەمیـەت، بـێ گومـان رووداوێكـی ترسـناك بـووە لـە مێـژووی ئادەمیەتـدا و وە بـە بەڵایـەكی

پشتشكێن لە ژیانی مرۆڤدا تۆمار دەكات، بەلایەك كە ئادەمیەت لە مێژووی خۆیدا نەیبینیوە:
ئیسلام فرمانەرابەرە گرتنی كاتێ بەدەستگرتووە كە زەوی تووشی خراپە بوبوو و وە ژیانێكی بۆگەن و رابـــەرانی خراپـــە، وە ئادەمیـــەت هــــەموو بەدبەختییەكی لە دەستی ئەم رابەرە گەنارانە"بۆن پیسانە" چێشتبوو، و:
(ظَهَرَ الْفَسَادُ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ بِمَا كَسَـبَتْ أَيْـدِي النَّاسِ).
پشـێوی، واتـە: برسـێتی و قـات و قـڕی و گرانـی، نائەمنی و خنكان و نەخۆشی و بومەلەرزە لە بەژوو و دەریـادا بەدیاركـەوت، بـە هـۆی تـاوان و گونـاهی خەڵكەوە... (روم/٤١)
ئیسلام بەم قورئانـە و بـەو بیركردنـەوە نوێیـە كـە قورئان بە دیاری هێنابووی، وە بە ئاینێك كە هـزری خـۆی لـەو وەرگرتـووە، دەسـەڵاتی ڕێبـەری لەدەسـت چوو. ئەم ئیشە لە دایك بوونێكی تازە بوو بـۆ مـرۆ، لە دایك بوونێك كە لە ڕاستیدا زۆر گەورەتر و باشتر لـە لـە دایـك بوونێـك كـە لەگەڵیـدا هـەنگاوی لەگـەڵ ژیاندا هەڵهێناوە و سەر لەنوێ بۆتە ژیانی ئەو. ئـەم قورئانە هزرێكی نـوێی لـە بـوون و ژیـان و دەسـتوور بۆ ئادەمیەت هێنایە بوون و كردیە دیاردەیەك بۆی.

هەر بەو شێوە کە گۆمەڵگەی ڕاستەقینە تایبەتی کرد بە کەسێك کە پێش ئەوەی قورئان پێشهاتی بۆ بکات، تەنانەت تێڕوانینیشی بۆی کێشە دەبێت. بەڵێ، پاکی و جوانی، گەورەی و بەرزی، فراوانی و سادەی، حەقبێژ و حەقگەڕی، هاودەنگی و هاوهەنگاوی، هەموو ئەمانە بە شێوەیەك بەڕاستیەوە چەسپا کە ئەگەر ویستی خوا نەبێ لە ژێی سێبەری قورئان و ڕێگا و ئاینی بەپێشهات بێ، نەدەچووە دڵی ئادەمیەتەوە. پاشان ئەم بەڵایە پشتشکێنە واتە بەکەنابردنی ئیسلام لە ئەمری ڕێبەرایەتی، ئەویش درایە پاڵی. پێشەوایەتیان لە دەست ئیسلام سەند تا نەفامی جارێکی تر لە شکڵ و شێوەی جۆراوجۆر لەسەر ئادەمیەت فەرمانڕەوای بکات. ئەم شێوە، هزری ماددەگەری بوو کە ئادەمیەتی ئەمڕۆ پێ سەرگەرم و دڵخۆشە هەروەك ئەوەی منداڵێك لە هەبوونی جل و بەرگی تازە و ڕەنگا و ڕەنگ و بوکەڵەشووشە و یاری منداڵانی جۆراوجۆر، شاگەشکە و خۆشحاڵ دەبێت. لە دونیادا، دەستەیەك لە گۆمڕاکەرو سەرلەشێواو فێڵباز و دوژمنی ئادەمیەتن کە ئاینی خوا لە تایەك و، نوێ بوونەوە مرۆ لە جیهانی ماددە لە تایەکی تر دادەنێین، ئەو کاتە بە ئادەمیەت دەڵێن: هەڵبژێرن!

یەکێ لەم دوو ڕێگە هەڵبژێرن: یان ڕێگای خوا لە ڕێــی ژیــان بگرەبــەر و، وە لەهــەر شــتێك دروســتی کردووە و دایناوە دەستی مرۆ لە جیهانی ماددەدایە و دووری لێبگــرن، یــان لــە بــەرووبوومی زانســت و زانیــاری مــرۆ ســوود وەرگــرە و لــە ڕێگــەی خــوا بــە دووربە، ئەم هەنگاوە، فێڵە پیسە و زۆر فێلبازانــە و فێڵکاریــە تەڕدەســتێکی پیســە. بــە هــیچ شــێوەیەك دارشتنی پرسەکە بەم جۆرە نییــە.. ئایینی خوای هــیچ کــات دوژمنــی داهێنــان و دۆزینــەوەو نــوێ بوونــەوە مــرۆ نییــە. بــەڵکو بــرەودان بــەم نــوێ بوونەوەو و ڕێنوینی یەی ئــەوان لــە ڕێگــەی ڕاســت و دروستە. تا مرۆ بتوانێ لە پلەی جێنشینی و ئــەرکی خــۆی بــە باشــترین شــێوە لــە ســەر رووی زەوی بگەیەنێتە ئەنجام، ئەو پلەیــەی کــە خــوا پــێ داوی و بۆ بەجێگەیاندنی توانایەکی داوە. توانا پێچ پێچی و شاراوەکانیش پــی بەخشیوی کــە بتــوانی بــە ئــەرکی خۆی هەڵسێ. لە یاسا و سوننەتی دونیای بــە هــەمان شێوە خستوویەتییە ژێــر فرمــانی خۆیــەوە و، وە لــە خزمــەتیا دایناوە و کــە لــە ڕێگــەی ئەنجامــدانی ئــەم کــارە و ئــەم فــەڕزە یــار و یارمــەتی بخــوازێ. خــوای گەورە لــە نێوان دروستکردنی مــرۆ و دروســتکردنی ئــەم دونیــا هاوئاهــەنگی دانــاوە، تــا لەســەر ژیــان و

کاروباری نوێ بوونەوە بە توانا بێت. داهێنان و نوێ بوونــەوەکانی بەهــەمان شــێوە پەرەســتن، عیبــادەت ئــەژمار دەکــرێن و وە هۆکارێــك لــە هۆکارەکــانی سوپاسـگوزرای لەســەر نیعمەتــەکانی خــوای گــەورە ئەژمار دەکرێت و وە نیشانەی پابەندی بە پاراستنی مەرجی بوونی پێچەوانەیە کە بـە هـۆی ئـەوە دەبـێ دۆربەندانە ئیش بکات و بکەوێتە جووڵە کـە خـوای گەورە پێی خۆش بێت و رازی بـوونی ئـەو بەدەست بهێنێت. ئەوانەی کە ئایینی خـوای گـەورە و رێگـەی خوای لە تایەك و، نـوێ بوونـەوەی مـرۆ لـە جیهـانی مادده لە تایەکی تر دادنێین، لە راستیدا زۆر بەدبین و بەدهزرن. هەرکاتێ ئادەمیەت ماندوو و مـەلوول و سـەرلێ شـێواو و سـەرەورۆ بێـت، لـەو رێگـەی کـە گرتوویەتیە بەر لە سەرگەردانی و، وا وەیلای، بێـزار و بێزانــدن بــێ و، بیــەوێ ســارەوانێکی دڵســۆز و رابــەرێکی دڵســۆز، گــوێ ی داخێــرێ و خــۆی لــە مەترســیگا بــەدوور بگرێــت و لــە ژێــر ســێبەری پارێزراوی پـەروەردگار بسـرەوتێ و، هێـرش دەکەنـە سەری و دەیتۆرێنن.

لەم رووەوشەوە، دەستەی دووەم هەم هەن کـە چـاکە خواز و چاکبیرن.. بەڵام ئەوانەی بچوك بیردەکەنەوە لە هەموو شوێنێك نواریان نییە و خاوەنی هەستی و

تێگەیشتنی قووڵیان نییە. دۆزینەوە و داهێنانانەکانی مرۆ لە ساحەی هێز و یاسای سروشتی ئەوانی مات و مەلوول کردووە. وە سەرکەوتنەکانی مرۆوەکان لە جیهانی ماددە، ئەوانی شێت و دێوانە کردووە، ئەم سەرگەردان و سەرلێ شێواویە کە دڵ لە ژێر دەستیان دەرهاتووە و وای لێکردوون کە هەموویان چاو لەو بکەن، ئاوێنەی هزر و شعوریان بەو شێوە نیشانی داوە. کە لە نێوان هێزانی سروشتی و نرخی ئیمانی جیاکردنەوە بهاوێژرێ و کاریگەری راستی ئەم نرخە ئیمانیانە کە لە خودی دونیا و بنەڕەتی ژیان حاشا هەڵنەگری جێ قبولکردن نییە، وانەبینرێ و هێزانی سروشتی و هێزانی ئیمانی لە یەکتر جیابکەنەوە!

ئەم گروپە بۆ یاسای سروشتی خاڵێکی تێر و تەسەڵ دادەنێن و بۆ نرخی ئیمانی، بە رێگای جیاواز رازین، وە بڕواشیان وایە کە یاسای سروشتی بێ کاریگەر بوون لە نرخ و بەهای ئیمانی ئەوا بەردەوام دەبن لەو خاڵە و بەرووبوومەکەی بەرهەمدار دەبێت، خۆزگە خەڵکی ئیمانیان دەبوو و خۆزگە ئیمانیان نەدەبوو، خوزگە ئایینی خوایان پێش دەخست یان دووریان لێ دەگرت، خوزگە لە یاسای خوای دەستوور وەردەگرن و رێگای شەریعەتیش لە پێش دەگرن،

خوزگە لە یاسا دەستکردەکانی مرۆی پەیڕەوییان دەکرد و وە بە فەرمانی خواستەکان و ئارەزووەکانی خۆی بەڵێ"لبیك" یان دەکرد! بەها ئیمانییەکان هەروەك یاسا سرووشتیەکانی تر، بەشێکە لە یاسا و سوونەتی خوای و بە تەواوی یەکسانن و پەیوەندییەکی توووند و توڵ لە نێوانیاندا هەیە. وە ئەنجامەکەیان پێکەوە بەستراوە. هەرگیز لە هزر و هەستی کەسی ئیماندار ناتوانرێ ئەوەمت دەستکەوێ کە لەسەر هەمبەر ئەو بتوانرێ نیوان ئەم دوو جیاکاری بکرێت.

ئەم جۆرە بیرکردنەوە، گومانێکی زیاتر نییە. ئەم کارە جوداکردنەوەی نێوان دوو جۆر یاسای خوایە کە لە بنەڕەتی هیچکامیان لەو دووانە لەیەك ترازان نییە.

ئەمە هەمان هزری راست و دروستە کە لە ژێر سایەی قورئاندا بە سرەوتاوی، قورئان لە دەروونددا پێشی دەهێنێ و وە دیاریەکیشی هەیە. ئەم جۆرە هزرە دێنێتە بوون ئەو کاتە کە باس لە خاوەن کتێبب و شوێنەکەوتووانی کتێبە ئاسمانییەکان لە رۆژگارانی کۆندا، وە لە دوورکردنەوەیان لە دەستووری ئەو کتێبانە و سەرەنجام و ئەنجامی ئەو لادانانە:

(وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْكِتَابِ آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَكَفَّرْنَا عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَلأدْخَلْنَاهُمْ جَنَّاتِ النَّعِيمِ وَلَوْ أَنَّهُمْ أَقَامُوا التَّوْرَاةَ وَالإنْجِيلَ وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْهِمْ مِنْ رَبِّهِمْ لأَكَلُوا مِنْ فَوْقِهِمْ وَمِنْ تَحْتِ أَرْجُلِهِمْ).

خۆ ئەگەر خاوەن کتێب و نامەکان بڕوایان هێناباو، لە نافەرمانی خوا خۆیان پاراستبا هەر گوناهێ کردبوویان دەمانپۆشی، وە دەمان بردنە ناو چەندین باخ و باخاتی پڕبوو خۆشی و ونیعمەت. وە ئەگەر مووسایی و عیساییەکان، هەستان بەکارکردن بە تەورات و ئینجیل و ئەو قورئانەی لە لایەن پەروەردگاریانەوە نێردراوە بۆیان ئەو دەمە لای سەروویانەوە و لەبەر پێیانەوە، ناز و نیعمەتی خۆیان دەخوارد... (مائیدە/٦٦،٦٥)

قورئان بەم شێوە هزرێك دادەهێنێ و ئەو کاتە لەسەر پەیمانی نوح بۆ هۆزەکەی دەفەرموێ:

(فَقُلْتُ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّارًا يُرْسِلِ السَّمَاءَ عَلَيْكُمْ مِدْرَارًا وَيُمْدِدْكُمْ بِأَمْوَالٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَلْ لَكُمْ جَنَّاتٍ وَيَجْعَلْ لَكُمْ أَنْهَارًا).

جا بەردەوام پێم گوتن: داوای لێخۆشبوون لە پەروەردگارتان بکەن، چونکە هەمیشە گوناح پۆشە، بارانتان پەیتا پەیتا و بە لێزمە بۆ بەردەداتەوە وە

دارایی و کوڕی زۆرتان پێ دەبەخشێت، کە ئەو دووشتە لەناو جۆرە مرۆڤێکدا، چەندین باخات و بیستانتان دەداتێ کە جوانترین هۆن بۆ رابواردن و خۆشی گەلان، ئاو و روباری زۆریشتان بۆ بەدی دێنێت کە لە ژێر بنکی درەختەکانییەوە، ئەو چۆمە ئاو دێ و دەڕوات. (نوح/ ١٠،١٢)

قورئان ئەم بیرکردنەوە دادەهێنێ ئەو کاتەی کە سەبارەت بە حەقیانەتی نەفسی خەڵکی و حەقیانەتی دەرەکی کە خوای گەورە بۆی رەوانە کردوون قسە دەکات وە لە نێوان ئەو راستیە دەروونی و دەرەکی پەیوەندییەك دەسازێنێ؛

(اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ لا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنْفُسِهِمْ).

بێ گومان خوا چارەنووس و نازو نیعمەتی خۆی لەهەر هۆزو و نەتەوەیەك ناگۆڕێ و، لێیان تێك نادات، تاکو ئەوان دڵ و دەروونی خۆیان نەگۆڕن... (رەعد/١١)

ئیمان بە خوا، پەرەستنی لێکدا و بەردەوامی ئەو، هەنگاو لەسەر شەریعەتی ئایینی ئیلاهی، هەموو ئەمانە بەڕێوبردنی یاسای خوایەکە، یاسایەك کە لە ژیاندا خاوەن شوێنەوارێکی پۆزەتیڤی کاریگەرە، وە لە هەمان سەرچاوە سەرچاوە دەگرێ کە هەموو

یاســـاكانی تـــری گـــەردوون كـــە شـــوێنەواری راستەقینەیان بـە هەسـت و شـارەزای وێنـا دەكـەین، سەرچاوەیان گرتووە و لەوەوە دێنـە دەرەوە. هەنـدێ جار، كاروباری رواڵەت فریـوی ئێمـە دەخەڵەتێنێ تـا پرسی لێكجوای و دووبەرەكی لـە نێوان سوونەتانی دونیای باوەڕ بكەین، بۆ نمونە كـاتێ دەبیـنین چـنگ بـردن بـۆ یاسـای سروشـتی لەگـەڵ ئـەوەی پـەیڕەوی نەكردنەی لـە نرخـی ئیمـانی كۆتابـەش و تـەواو بـە سـەركەوتن دەگـەن، تووشـی ئـەم جـۆرە دوو دڵیـە دەبین. ئـەنجامی ئـەم دووبـەرەكی و لێكجیابوونـە چ بگـا بـەوەی كـە لـە سـەرەتای فرمانـدا دەرنەكـەوێ، بەڵام لـە ئەنجامـدا پەیـدا دەبێـت. ئـەم فرمانـە هـەر وەك كۆمەڵگەی ئیسلامی هاتووە و دامێنگیری بـووە. چونكە هێڵی بەرزی ئیسلام، لە خاڵی یەكبڕی یاسـای سروشتی لەگەڵ نرخی ئیمانی و سوودوەرگرتن لێـی بۆ ژیان، دەستی پێكرد. وە هێڵی داكەتنی ئیسلام، لە خاڵی لێكجوداى ئـەم دوانـە دەسـتی پێكـرد، وە هـەر ئەندازە گۆشەی ئەو لێكجودایە، زیـاتر فـراوان بـووە. داكـەتنی ئیسـلام زیـاتر و نشێوی توونـدتر بـووە تـا ئـەو جێگایـەی كـە سـەبارەت بـە هـەردوو یاسـای سروشـــتی و نرخـــی ئیمـــانی ئاســـانكاری و بـــێ ڕێنوێنیـەكی نیشـان دا، وە سـەرەنجام گەیشـتە خـاڵی

نزمـایی و بــه ســووکی و زیللەتــەوە دانیشــت.. لــە لایـەکی تــر، ئەمڕۆکـە شارسـتانیەتی مـاددە جـێگیر بووە، کە وەك باڵندەیەکە کە بە باڵێکی بـەهێزەوە و تووونـدەوە لـە فڕینـدا بێـت و وە باڵەکـەی تـری شـکا بێت، بە هـەمان ئەنـدازە کـە لـە نـوێ بـوی، ونـەوەی ماددی بـەرز دەبێتـەوە، لـە رووی نرخـی دەروونـی و مرۆی دێتە ئاستێکی نزم ونزم دەبێتەوە. خەڵکی بە ئەندزەیــەك لـــەم بابەتــە تووشـــی پرێشـــانی و سەرگردانی و نەخۆشی دمروونی و نەخۆشی دەماری بوون کـە بیرمەنـدان لەدەسـتیان هاتوونەتـە هـاوار و پــڕ بــە دەمیــان هــاوار دەکــەن. تــەنیا رێگــارەو و دەرمانێــك، رێگــەی گرتنەبــەری ئــایینی خــوایی و دەست گرتن بە دەستووری ئاسمانییەوە. ئایینی خـوا شـەریعەتەکەی کـە بـۆ خۆشـبەختی مـرۆڤ هـاتووە، بەشێکی لـە یاسـای گشـتی کـە حـاکم و فـەرمانڕەوای دونیایـــە. بـــەڕێوبردنی ئـــەم دینـــە، بـــێ گومـــان شـوێنەوارێکی پـۆزەتیڤ لـە پێشـهاتی پەیوەنـدی و هاودەنگی ئیشی خەڵکی و ئیشی"کاروبار"ی دونیـاوە هەیە.

چ دینێك جگە لە میوەی ئیمان نییە و نـاتوانێ جیـا لـە قـەدی گـەورە خـۆی بەسـەرپێوە بمـێنێ.. چـونکە دین دانراوە تا لە کۆمەڵگەی موسڵمانان لە هـەنگاوی

جــێ بەجێکردنــدا دابنــرێ و لــە دروســتکردنی کۆمەڵەی ئیسلامی بەشدار بێت. دینیش بە هزرێکی فراوان کە ئاینی ئیسلام سەبارەت بە دونیـای گـەورە و دونیای مرۆڤ هەیە، گەیشتۆتە ئاستی کامڵ بـوونی خۆی و بە یارمەتی لەوەی کە ئـەم هـزرە گرنگـە لـە پێشدا: پارێزگاری دەروونی، هەستێکی پاك، هەوڵدان و گرنگـــی پێـــدانێکی فـــراوان، بـــەرزی هـــەڵس و کەوت"ئەخلاق بەرز"، راستی و ناڕاستی لە رەفتار و کــرداردا.. بــە گەشــەی کامــڵ و تــەواوی خــۆی گەیشتووە. بـەم شـێوە، کامـڵ بـوون و هـاودەنگی لـە نێوان هەموو یاساخواییەکان روون و ئاشکرا دەبێـت، خۆزگا یاسـایەك کـە یاسـای سروشـتی نـاودەنێین، وە خۆزگە یاسایەك کە بە بایەخی ئیمانی ناو دەبەین.. چ هــەر کامیــان لــە یاســای خــوای بــووە کــە ئــەم جیهانەیان لەبەرگرتووە.

مــرۆ هــەم توانایەکــە لــە تواناکــانی دونیــا، کــردار و ویست و پەرەستن و هەوڵدانی بەشێکن لەو توانایانە کـە خـاوەن پاشماوەیـەکی پۆزەتیفـە لـە پانتـای ئـەم جیهانە بەرفراوانەدا و لەگەڵ ئـــــەو یاســــای دەرگــیرەی هەســتیەی لــە پەیوەنــدا دەبێــت. و وە هــەمووان بــەو گیــانی هاوکاریــە تــەواوە دەپرژێنــە ســـەری. وە چـــون لەگـــەڵ یـــەك کۆببنـــەوە و

هاوهەنگاوبن لەگەڵ یەکتری، بە تەواوی ئەنجام دەدات بەدەستەوە و سوودی دەبێت. بەڵام گەر لەیەکتر جیاببنەوەو هاوهەنگاو نەبن لەگەڵ یەکتر، ئەنجامیان بە فیڕۆ دەچێت و شڵەژاوشێواوی حاکم دەبێت بەسەریدا و هەموو ژیانیان بە خراپی دەڕوات و بەدبەختی و خراپ و نەهامەتی لە نێوان خەڵکی بلاّو دەبێتەوە و داوێنگیریان دەبێت:

(ذَلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ لَمْ يَكُ مُغَيِّرًا نِعْمَةً أَنْعَمَهَا عَلَى قَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنْفُسِهِمْ).

واتە: ئەو سزایەش لەبەر ئەوە تووشیان بوو، چونکە: خوای گەورە هەر بەهرەو بەخششێکی بەهەر گەلێك دابێ، لێ نەگۆڕیوەو لێ تێکنەداوە هەتا ئەوا بیری خۆیانیان نەگۆڕی بێ. (ئەنفال/٥٣)

بۆیە لە نێوان کرداری و تێگەیشتنی مرۆ و لە نێوان سەرهەڵدانی ڕووداوەکانی دونیا، بە پێی یاسا فراوان و گشتگیرەی خوای ڕوودەدەن، پەیوەندییەکی تووندوتۆل و دامەزراوە. هیچ مرۆیەك لە بچڕانی ئەم پەیوەندیە قسە ناکات و خەڵکیش بۆ تێکدانی و ئاڵۆزکردنی ئەو گیانی هاوکاریە بانگ ناکات و وە ئەوان لە یاسای خوای بەردەوام لە هەیکەلی دونیا بە دوور ناگرێت، مەگەر ئەو کەسەی کە دوژمنی ئادەمییەت بێت و، بیەوێ لە ڕێنمای و ڕێنوینی

خـوای رایوەسـتێنی و بیتـۆرێنێ. لـە سـەر ئادەمیـەت پێویسـتە کـە ئـەو جـۆرە کەسـانە لـە خـۆی دوور بکاتـەوە، وە دووری بخاتـەوە لـەو رێگـەی کـە بـەرەو رووی پەروەردگارت گرتووتـە بـەر. ئەمانـە بەشـێکن لـە یـادەوەری و بـەرکارانێك کـە لـە کـاتی ژیـان بەسەربردنم لـە ژێـر سـێبەری قورئانـدا کـە بـەردڵی گرتـووە. ئومێـد هەیـە کـە خـوای گـەورە بـە بۆنـەی ئەوانـە خـەڵکی سـوودی پـێ بگـات کـە ئەوانـە بەرەورووی خۆی هیدایەت بدات.

(وَمَا تَشَاءُونَ إِلا أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ).

وە ئێوە ئارەزووی ئیستیقامە"خۆڕاگری" ناکەن، مەگەر خوای خاوەنی جیهانەکان ئارەزووی بکات، جا کـەوابوو داوای یارمـەتی لەهـەر ئـەو بکـەن... (ئینسـا/ ٣٠، تەکویر/٢٩)

# تەفسیری سورەتی ئیخلاس

بسم الله الرحمن الرحيم

(قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ (١)اللَّهُ الصَّمَدُ (٢)لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ (٣)وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ) (٤

ئەم سورەتە بچوکە یەکسانە بە سێ یەکی قورئان هەروەك لە ریوایەتی سەحیحدا هاتووە، بوخاری دەڵێت: ئیسماعیل بۆمان دەگێڕێتەوە: مالیك بۆی گێڕامەوە لە عەبدورەحمانی کوڕی عەبدوڵای کوڕی عەبدورەحمانی کوڕی ئەبو سەعسەعە وئەویش لە باوکی و باوکیشی لە ئەبو سەعید پیاوێك گوێی لە پیاوێك بوو "قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ"ی دەخوێند و دووبارەی دەکردەوە. جا کاتێ بەیانی داهات، چووە لای پێغەمبەر((صلی الله علیه و سلم)) ئەوەی بۆ باس کرد وەك بلێی ئەو پیاوە زۆر بە کەم تەماشای ئەو-سورەت-ەی کردووە، جا پێغەمبەر((صلی الله علیه و سلم)) فەرمووی"سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئەوە یەکسانە بە سێ یەکی قورئان".

مایەی سەرسوڕمان و سەرسوڕهێنەراوی نییە. لە بەرئەوەی یەکتاپەرەستی فرمان کراوە بە

پێغەمبەر((صلى الله عليه و سلم)) تا رایبەگەیەنێ(قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) یەکتاییەکی عەقیدەییە بۆ دڵ و دەروونەکان، رۆشنکەرەوە و شیکردنەوەی بوونە، بەرنامەیە بۆ ژیان.. ئەم سورەتە گەورەترین هەنگاو پلانی سەرەکی لە راستێتێ ئیسلام نیشان ئەدا.

(قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ)) واتە: ئەی موحەممەد"صلى الله عليه و سلم" بڵێ ئەی پەروەردگارەی مـن دەپەرستم تاك و تەنیایە و هاوەڵ و هاوبەشی نییە. ئەوە زاراوەیەکە-احد- کە لە زاراوەی(واحد) راستترە و گونجاوترە، چونکە زاراوەی-احد- بۆ مانای(واحد) زیاتر دەکات کە هیچ شتێك جگە لەو نیە و هیچ شتێکیش وەکو ئەو نابێت.

ئەوە یەکتاییەکی بوونە.. هیچ راستیەك لەو راستتر نییە. هیچ بوونێکی راستی نیە جگە لە بووونی ئەو. وە هەموو بوونێکی تر پشت بەو دەبەستێ لە بوونی راستی ئەودا و زاتی خۆیشی هەر لە بوونی ئەودا دەدۆزێتەوە.

ئەوەش یەکتاییەکی بەهێزی-کاریگەرە- هیچ کەس وەك ئەو نییە، وە هیچ کەسیش لەو ناچێ و لە هەموو ئەم گەردوونەدا ئەسڵەن وەك ئەو نییە.

ئـەوەش عەقیدەیەکـە لـە دەروون و رۆشـنکەرەوە و رووونکردنەوەیە بۆ بوون.

جـا کـاتێ ئـەم روونکـەرەوە جـێگیر بـوو، وە ئـەو وێنایانـــەی رۆشـــنکردەوە، دڵ لـــە هـــەموو بەڵاوموسـیبەت و هـەموو کـەم و کورتیـەك رزگـار دەکـات لـە هـەموو ئەوانـەی کـە پەیووەنـدیان بـەم یەکتایە تاکەوە نییە کە راستی بوون و راستیەکی بە توانا و کاریگەرە.

رزگـاری دەکـات لـە هـەر شـتێکی ئـەم بوونـە کـە پەیوەنـدی بـەوەوە نـەبێ- گـەر نـەتوانێ لـە بوونـدا شتێك لە شتەکان رزگار نەکات ئەوا هیـچ راسـتیەکی بۆ بوون، جگە لە بوونی خـوا بـوونی نییـە، وە هـیچ جۆرە راستیەکی بەهێز جگە لە ویستی بەکاریگـەری ئەو بوونی نییە. باشـە بـۆ دڵ خـۆی هەڵدەواسـێ بـە شتێکەوە کە بوونێکی بەکاریگەر نییە؟!!

کـاتێ کـە دل پـاراو و رزگـاربوو لـەوەی کـە جگـە لـە راسـتێتی تـاکێتی ئـەو نییـە و ئـەوەی جگـە لـەو پەیوەندی بەو راستێتیەوە نییە.. جا لـەو کاتـەدا لـە هـەموو کۆتێـك ئـازاد دەبێـت رزگـار دەبێـت لەهـەر بەنـد و تـەوقێك. ئـازاد دەبێـت لـە هـەر ویسـت و ئارەزوویەك کە بنەمای کۆت و بەنـدی زۆرە، و ئـازاد دەبێت لە هەر ترس و ناڕاحەتیەك کە بنەمای کۆت

و بەنـدی زۆرە. حـەز و ئـارەزووی لـە چـی بێـت کـە خوای خۆی هەیە؟ و لە چ شـتێك تـرس و ناڕاحـەتی هەبێ کە جگە لە توانا و هێزی ئەو (خوا) کەسی تر نیە.

جـا کـاتێ ئـەم وێنایانــە جـێگیر بـوون لـەوەی کـە بوونێکی تر نابینرێ جگە لـە راسـتێتی ئـەو خوایـە، ئـەوا هـەر روو و وێنایـەکی تـر کـە سـەر هەڵـدا لـە هەموو بوونێکی تر ئەوا لە خوای گەورە سەرچاوەی گرتووە. ئـەوەش پلـە و مەنزلگایەکـە کـە دڵ دەسـتی خـوای گـەورەی تێیـدا دەبـینێ لـە هـەر شـتێك کـە دەیبینێ. لە پشت ئەو پلە و مەنزلگایەدا شـتێکی تـر لەم گەردوونەدا جگە لە خـوا نـابینێ. لەبـەر ئـەوەی جگە لە راستێتی خوای گەورە راسـتێتی کەسـی تـری تیا نابینێ.

رەتی هەر هێز و توانایەك دەکاتـەوە، هـەموو شـتێك و هەموو رووداوێك و هەموو جووڵەیەك بۆ هۆکـاری سەرەتای دەگەڕێتـەوە.. کـە لێـوەی هـاتووە و لـەوەوە سەرچـاوەی گرتـووە و کاریگـەری هـەبووە لەسـەری.. ئەوەش راستیەکە کـە قورئـانی پشـتگیریەکی مـەزنی دەکـات بـۆ جێگیربـوانێکی وێنایـەکی ئیمـانی. هـەر بۆیــە قورئــان بــەردەوام هۆکارەکــانی دەرەکــی و رووەکەشــی بــەردەوام دەوران دەداتــەوە و ئــەو

کاروبارانـــەی پەیوەنـــدی راســـتە و خـــۆی بـــە پـــەروەردگارەوە هەیـــە دەیداتـــە دەســـتی ئـــەو (وما رميت إذ رميت ولكن الله رمي). (انفال/١٧)
(وما النصر إلا من عند الله) . (انفال/١٧)
(وما تشاوون إلا أن يشاو الله). (انسان/٣٠

لەوە زیاتر هەیە..
بە دەوردانی هـەموو هۆکـارە دەرەکییـەکان.. هـەموو کاروبارەکان دەدرێنە دەست خوای پەروەردگاری تـاك و تەنیا و ئەوانەش دەڕژێنە دڵەوە کـە پێـی ئـارام و دڵنیا دەبێ.
وە ئاڕاســتەی یــەکتایی خــوای دەناســێ کــە هــەر چــییەکی بــوێ لێــی داوا دەکــات، خۆشــی دەپــارێزێ لەوەی دەترسێ.
ئەوەش پلە و ڕێگایانێکە کە مەتەسـەوفەکان هـەوڵی بۆ ئـەدەن.. کـە ئـەوەش دووری خستوونەتەوە.. جـا بۆیە ئیسلام داوا لـە خـەڵکی دەکـات کـە ڕێگـەی ئـەم ڕاستیە بگرن. لەگـەڵ ئەوەشـدا لەگـەڵ ئـەو ژیانـەی ڕاسـتەی کـە هەیـە دەسـت و پەنجـەی لەگـەڵ نـەرم دەکـات بــە هــەموو تایبەتمەندییەکانیــەوە. ژیــانی ئـــادەمی درێـــژ دەکاتـــەوە لەگـــەڵ هـــەموو ئـــەو جێنشینایەتیە کە لە زەوی هەیـە بـە هەموو هێـز و تایبەتمەندییــە بنەڕەتییەکانیــەوە. هــیچ ڕێگــا و

ڕێچكەيەك نييە جگە لە حەقيقەتى ئەو و هيچ بوونێك نييە جگە لە بوونى ئەو و هيچ كار و هێزێك نييە جگە لە كارێگەريبوونى ئەو.. جگە لەم ڕێگاش هيچ ڕێگايەكى ترى ناوێ.

ئا لێرەدا بەرنامەى تەواو و كامڵ بۆ ژيان دەستەوەردەبێ.. ئەوەى بە تەواوى دەمێنيتەوە بە تەفسيركردنێكى تەواو روون و وێنايانێكى جوان و ئاراستە پێكراوانێكى هەستاوى كە ئەويش بريتيە لە دانانى بەرنامە و پرۆگرامێكى بۆ بەندايەتيكردنى خواى تاك و تەنيا كە جگە لەو هيچ راست و حەقيقەتێك نييە و هيچ كەس لە هێز و دەسەڵات لەو ناچێ و هيچ ويست و ئيرادەيەكيش نييە جگە لە ويست و ئيرادەى ئەو.

بەرنامە و پرۆگررامێكە كە ئاراستەى خواى تاك و تەنيا دەكات لە خۆشى و ترساناندا لە ويستن و نەويستندا و لە كات بون و نەبووندا و لە خۆشى و ناخۆشيدا لە كاتى ناز و نيعمەتدا و لە دەستدان و نەبوونى نيعمەتدا ئاخر بوونێك كە بوونێكى حەقيقى و راستى نييە رووكردن بۆى چ سوودێكى هەيە..؟

بەرنامەى وەدەستكەوتوو لە خواى تاك و تەنيايە.. وەدەستكەوتووى عەقيدە و دونيايى و بيركردنەوە و

راستە شەقامان و یاسایانێکی رێك و پێکراو و ئاداب و کۆمەڵە کلتوورێکی جوان.. وەدەستکەوتووانێك تەنیا لە بوونی تاك و تەنیای و راستی ئەودا لە واقعی ویژداندا دەبێ.

بەرنامە و پرۆگرامێکە بۆ جوولە و ئیش کردن بۆ خوای تاك و تەنیا و هەوڵدان بۆ نزیکبوونەوە لە راستێتی و هەوڵدان بۆ رزگاربوون لە بەربەستانێك کە رێی لە ئامانجەکانی مرۆڤ دەگرن. جا جاری وا هەیە ئەو کۆت و بەربەستانە لە ناخی کەسەکان یان لە دەورووبەردا هەیە.

بەرنامە و پرۆگرامێکە لە نێوان دڵی مرۆڤ و هەموو بوونێکی تردا پەیوەندیەك دروست دەکات بە پەیوەندی خۆشەویستی و میهرەبانی و هاودڵی بۆ یەکتر.. ئەوەش بە مانای رزگاربوون لە کۆت و بەند و ناراحەتیەکان نییە.. ئەوانە هەر هەمووی دەستکردی خوای گەورەن هەمووان خۆیان لە بوونی ئەو دەدۆزنەوە.. هەمووان نووری خۆیان لەو وەردەگرن.. هەموویان خۆشەویستن چونکە هەموویان لە خۆشەویستن..!!

ئەم بەرنامە و پرۆگامە بەرنامەیەکی ئازادە.. زەوی تێیدا بچووکە و ژیانی دونیاش کورتە.. سوود

وەرگـرتن و چـێژ وەرگـرتن لـە ژیـانی دونیـادا بـێ سـوودە.. وە ئـازاد بـوون لـەو بەربەسـت و کـەم و کورتیانە ئومێدێکە.. بەڵام ئازادبوون و دەربـازبوون لە ئیسلامدا بەو مانا نییە کە کۆشـەگیر و بێـزاری و بـێ تاقـەتی لـە پـێش بگـرین.. بـەڵکو بـە مانـای هەوڵـدانی بـەردەوام و پێکـدادانی بـەردەوام دێ بـۆ قەرەبووی هەمووی ئادەمیەت دێ رزگاربوونی ژیانی مرۆڤ بە گشتی و ئیشی مرۆڤـەکانیش جێنشـینایەتی و رابـەری کردنـە بـە هـەمووی ناراحەتیەکانـەوە کـە هەیـەتی.. لەگـەڵ ئـازادبوون و دەربـازبوون لەگـەڵ هەموو ئەو بنەمایانەی کە هەیـەتی هـەروەك پێشـتر وتمان.

ئازاد بوون و دەربازبوون لە رێگای سومعەوە ئاسان و سادەیە.. بەڵام ئیسلام ئـەوەی نـاوێ.. لەبـەر ئـەوەی جێنشیایەتی لەسەر زەوی و سەرکردایەتی کردنی بۆ مـرۆڤ بەشـێکە لـە بـەرنامی خـوای تـاك و تـەنیا بـۆ ئازاد بـوون و دەربـازبوون. ئـەم ریگایـەش سـەختر و ناخۆشـترە.. بـەڵام رێگایەیەکـە کـە مرۆڤایەتیـەتی مـرۆڤ تەحـەقوق پەیـدا دەکـات.. هـەموو ئەوانـە بانگەشوانانێکی سەرەتایین کە کەم و کورتی دەهێنن لە راستێتی تەوحیـد بـە وینـای راسـتیەکەی چـونکە تەوحید بەم شێویە لە عەقیدە و ویژدان و دەرروندا

تەفسیری بوون و بەرنامەی هەموو ژیان دەكات وە وشەیەك نییە تەنها بە زمان بوترێ یان تەنانەت بە شێوەیەك لە ویژدان و دەروونـدا جێگیر بێت.. ئەو"تەوحید" بە شێوەیەكی گشتیە و دینیش بە شێوەیەكی گشتییە. ئەوە جگە لەو درێژە پێدان و دابەشكردنانێكە زیاتر لەوە نییە كە بەرهەمی سرووشتیە بۆ جێگیربوونی ئەو راستیە لە دڵەكاندا بێت.

پێشتر ئەو لادانانەی كە تووشی ئەهلی كیتاب بوو هەمووی عەقیدە و وێناكانیان و ژیانیانی پیس و خراپ كردبوو... چونكە ئەو شتەی كە لێوەی سەرچاوەی گرتبوو داپۆشەرەی حەقیقەتی تەوحید و وێنا راستیەكەی بووە. بە دوای ئەو پۆشەرەش لادراوەكانی تریش سەریان هەڵدا. لە عەقیدەی ئیسلامیدا شكڵ و شێوەی تەوحید پلەیانێك پەیدا دەكات كە رۆ دەچێت لە ژیاندا و هەموو ژیانیش لەسەر ئەو بنیاتدەنرێ.. بنەمای بەرنامە و پرۆگرامی ئیشی واقعی رۆژانە لەو وەردەگیردرێ.. وە عەقیدەش لەسەر ئەم پایە بنیاتدەنرێ.. سەرەتای ئەم شوێنەوارە ئەوەیە كە شەریعەت و فەرمانڕەوا دەبێ هەر وەك لە بیروبارەوڕیش وایە.. جا سەرەتای ئەم تەوحیدە تەنها شەریعەتی خوا

حاكم و فەرمانڕەوا دەبێ و حوكم بەسەر ژیاندا دەكات جا كاتێ ئەو شوێنەواری تەوحیدە لادران و جیاكاری تیاكرا و لە ژیاندا نەبووە فەرمانڕەوا ئەوا عەقیدەی تەوحید و یەكتاپەرەستی دامەزرا و نابێ.. مەگەر ئەوەی كە شوێنەوارەكەی لە هەر روكنێك لە رووكنەكانی ژیان جێگیر دامەزرا و دەرنەكەوێ..!

وە واتای ئەوەی كە خوا تاك و تەنیایە ئەوەیە كە: خوای سەروەری هەمووانە و جێبەجێكاری هەموو پێداویستییەكانە.. نە لە كەس بووە و كەسیش لەو نەبووە و هیچ كەس هاوتا و هاوشێوە نییە.. قورئان ئەوانەش زیاتر روون و ئاشكرا دەكات.
(اللَّهُ الصَّمَدُ) (٢) واتە: ئەو خوایەی كە ناوی"الله" جێگەی ئومێدە و بێنیازیشە هیچ كەسێك بێ لەو شایەنی ئەوە نییە گیرو گرفتەكان ببرێنە لای بۆ چارەسەر.. هەر ئەو زاتەش گەورەیە.
واتەی زاراوەی"صمد" رابەرایكردن و گەورەی مەبەستەكان كە هیچ ئیشێك بێ ئیزنی ئەو ناكرێ.. ئەو گەورە و فەرمانڕەوایەكە كە بێجگە لەو هیچ سەروەرێكی تر بوونی نییە. ئەو تاكە لە"الوهیت" دا و هەمووان بەندەی ئەون و بۆ پێویستییەكان هەر روو لەو دەكرێ و مەبەست و ئامانجیش هەر

ئەوە. هەموو كاروبارەكان بە ئيزنى ئەو دەكرێن. هيچ كەسێكى ترى لەگەڵدا نييە لە بەرێوبردنى كارەكاندا ئەم سيفەتەش هەر لەسەرەتاوە بووە و چونكە خوا تاك و تەنيايە.

(لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ) (٣) واتە: كەسى لێ نەبووە و هيچ ڕۆڵەيەكى نييە..!وە لە كەسيش نەبووەو بێ دايك و باوكە، چونكە هەموو شتێكى لە دايك بوو تازەيە و نوێيە

ڕاستێتى خوا تەواو جێگير و هەميشەييە.. هيچ كات لە دوا كات و سات دامەنگيرى نابێت.. سيفەتەكانى تەواو ڕەهان لە هەموو ساتەكاندا.. لە دايك بوون و بوونێك كەم و زياد ئەوە بۆ خواى گەورە مەحاڵە و ئەو سيفەتەى نييە.. جگە لەوەش زەوجيەتيش نييە.. هەموو ئەوانە مەحاڵن وە سيفەتى "احد" نەفى و ڕەتكردنەوەى باوك و كوڕە.

(وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ) (٤) واتە: هەرگيز هيچ كەسێك هاوشێوە و هاوتاى نييە و كەسێك ناتوانێ بەرهەڵستى بكات.

هيچ كەس هاوتا و هاوشێوەى ئەو نييە نە لە حەقيقەتى بووندا و نە لە حەقيقەتى توانا و دەسەڵاتدا و وە نە لە هيچ سيفەتێك لە سيفەتەكانى

زاتـی ئـەو. ئـەوش لـە "احـد" وەدەسـت دەكـەوێ ئەمەش دڵنيا و درێژە پێدەرە هەيـە. ئـەوەش رەتـی بيروباروەڕی دووپەرەستی دەكاتەوە كە گومان دەبات خـوا خـۆی خێـرە و وە شـەڕی بـۆ خوايـەتی خـۆی هەيــە- بــە گومــانی ئــەوان- كــە لــە گــەڵ خــوادا دوژمنداری دەكات وە ئيشە باشەكانی خـوا بـە ئيشـە خراپــەكان دەگۆڕێتــەوە وە لــە زەويشــدا فەســاد و خراپە بڵاو ئەكاتـەوە بـە ناوبـانگترين بيروبـاوەڕی دوو خوای لە لايەن ئێرانييەكان بووە كە باوەرشـيان وابووە خوای نوور و خـوای تـاريكی و زوڵـم هـەبووە ئەوەش لە باشوری دورگەی عەرەبی بەناوبانـگ بووە كە ئێرانيەكان دەسەڵات و حوكومەتيان هەبووە.
ئەم سوڕەتە چەسپاندن و رووشنكەرەوەی عەقيـدەی ئيسـلاميیە. هـەروەك سـوڕەتی كـافيرون رەتـی هـەر وێكچوون و سازشێك دەكاتەوە لـە نێـوان بيروبـارەڕی يەكتای و بيروباروەڕی هاوەڵ بۆدنان. هەر يـەك لـەو دوو سـوڕەتە چارەسـەری راسـتی بيروبـاروەڕ دەكـات. پێغەمبـەر دروودی خـوای لێبێـت نوێـژی سـوونەتی بــەيانی بــەم دوو ســوڕەتە دەســتپێدەكرد ئــەم دەسـتپێكردنەش مانـا و مەبەسـتی تايبـەتی خـۆی هەبووە.

## دیمەنی سورەتی "هومەزە" لە رۆژی دوای دا

{ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ
{وَيْلٌ لِكُلِّ هُمَزَةٍ لُمَزَةٍ * الَّذِي جَمَعَ مَالًا وَعَدَّدَهُ * يَحْسَبُ أَنَّ مَالَهُ أَخْلَدَهُ * كَلَّا لَيُنْبَذَنَّ فِي الْحُطَمَةِ * وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْحُطَمَةُ * نَارُ اللَّهِ الْمُوقَدَةُ * الَّتِي تَطَّلِعُ عَلَى الْأَفْئِدَةِ * إِنَّهَا عَلَيْهِمْ مُؤْصَدَةٌ * فِي عَمَدٍ مُمَدَّدَةٍ}

((سزای سەخت بۆ هەموو توانجگرێکی عەیبگر!! ئەو کەسەی ناوی خەڵکی بە خراپە ئەبات و، بە شوێن کەم و کورِی و نەنگی ئەکەوێ* ئەو کەسەی کە ماڵێکی زۆری کۆکردەوە و هەر خەریکی ژماردنی بوو بێ لێکدانەوەی حەلاڵ و حەرام* وا خەریکە بە دونیاوە پێی وایە ماڵ و سامانەکەی بە ئێجگاری لە دونیادا دەیهێڵێتەوە و هەرگیز نامرێ، بۆیە رەفتاری وا دەکات* با وانەزانیت"هەرگیز! هەرگیز!" سوێند بە خوا بە سووک و ریسوای فڕێ دەدرێتە ناو تێکشکێنەر"حوتەمە"* جا تو چوزانیت ئەو تێکشکێنەرە چییە ئەگەر خوا بۆت باس نەکات* ئاگرێکی هەڵکراوی بڵێسەداری خوایە و بە فرمانی ئەوەو فریشتەی ئەوی لەسەرە* ئەو ئاگرێکی وایە

رووده‌کاته بنۆکه‌ی دڵه‌کان و، په‌ڕه‌ی دڵه‌کان ده‌سوتێنێ که سه‌رچاوه‌ی کوفر بوون* به‌ڕاستی ئه‌و ئاگره ده‌وره‌ی داون و، له‌سه‌ریان داخراوه و، دایپۆشیون، نه هه‌وای تێ ده‌چێ و نه‌هه‌وای لێ دێته ده‌ر* ئه‌وان به‌سراونه‌ته‌وه له ناو چه‌ند کۆڵه‌که‌یه‌کی درێژکراوه‌دا.))

وێنایه‌کی ماددیانه و ناوه‌کیانه له ئازاردا ، وێنه‌یه‌کی هه‌ستی و هزریانه له ناو ئاگردا ده‌نه‌خشێنێ. له به‌رامبه‌ر ئه‌وه‌شدا و له نێوه‌نده‌دا تاوان و، رێگای پاداش و، که‌شی تۆڵه‌سه‌ندنه‌وه تێبینی ده‌کرێ. جۆرێك که وێنای عه‌یب و عارو، توانجگر و گاڵته‌پێکردن به خه‌ڵکی به گیان ئابرووی ئه‌وان خووی گرتووه، له‌و کاته‌شدا ماڵ و سامان کۆده‌کاته‌وه‌و، وا گومان ده‌بات ئه‌م کرده‌وه‌ی ده‌بێته که‌فیلی مانه‌وه‌ی هه‌تا هه‌تای بۆی، له به‌رابه‌ر ئه‌و وێنه‌شدا ئه‌م خۆی باشتر له نێو ئه‌و گاڵته پێکه‌ره‌ی پشت ئه‌ستوور به ماڵ و سامان، له نێو وێنای"به‌ربلاو"ی ڕۆچوو وازلێهێنراو له "حطمة"دا. ده‌بینێته‌وه. که هه‌رشتێك بخرێته ناوی ورد و خاشی ده‌کات و بوون و گه‌وره‌ی تێیدا تێکده‌شکێنێ. حوته‌مه ئاگرێکه زاڵه به‌سه‌ریه‌وه و که داخ ده‌نێت به‌سه‌ر دڵی دا، که له‌و"دڵه‌دا" عه‌یب و عار و توانجگه‌ری و گاڵته پێکه‌ر خۆی حه‌شارداوه.

تەواوكەری وێنای تێك و پێكشكاوی بەربلاوی ڕۆچووی لە ئاگری لەسەری قوفلدارو بەم شێوە دەبێت كە هیچ كەسێك لێی دەرباز نابێت و كەسیش تێیدا پرسیار ناكات.. بە ستوونێكی گەورەو بەرز بەستراوەتەوە، هەروەك چوار پێەك كە زۆر بە بێڕێزی بەسترابێتەوە. لە پیتچنینی ووشەكاندا، هێشتا ناڕاحەتی و بەندبوون هەیە:((عددة، كلا، لینبذن، تطلع، ممدة)) مانای وشەكان(چەند جارێك دەیژمێرێ، هەرگیز! هەرگیز!، پرت و بلاوبووەوە، سەركەوتوو"زاڵ".

زەبوونانێكی جۆراوجۆر، دڵنیاییەكی تەواو خۆی دەنوێنێ.(( *با وانەزانیت"هەرگیز! هەرگیز!" سوێند بە خوا بە سووك و ریسوای فڕێ دەدرێتە ناو تێكشكێنەرە"حوتەمە*یە.. ..* ئاگرێكی هەڵكراوی بڵێسەداری خوایە و بە فرمانی ئەوەو فریشتەی ئەوی لەسەرە* ئەو ئاگرێكی وایە روودەكاتە بنۆكەی دڵەكان و، پەڕەی دڵەكان دەسوتێنێ كە سەرچاوەی كوفر بوون*)) لە هەموو ئەمانەدا هێشتا وێنایەك لە یەكگری بوونی هەیە كە لەگەڵ كردەوەی"خراپ" و"گەڕان بەدوای عەیب و عاری خەڵكی دا"كە "وا گومان دەبات ماڵ و سامامانەكەی دەیهێڵێتەوە"و یەكگری دەكات.

# فەلسەفە ئیسلامی و غەیری ئیسلامی لە دیدی و تێڕامانی

سەبارەت بەوەی کە فەلسەفە تا چ ڕادەییەك دەمانگەیەنێتە ڕاستییەکان و ڕاستییەکان تا چەندە دەتوانێ ڕوون بکاتەوە مرۆڤ بگەیەنێتە ئاستی کامڵبوون!! ئەو کامڵبوونەش کاتێك دەبێت کە خۆی بداتە دەست ئیسلام.. وەك ئەوەی یەکەم کە چۆن بوون لەگەڵ ئیسلامدا! (چەندێك مرۆڤ خۆی خەریك بکاتە بە بیرکردنەوەی غەیری ئیسلامی، بەڕاستی بۆی دەردەکەوێت کە پێکەنین هێنەرە.. تەنیا گۆشەیەکی ڕاستیەکان دەگرێتە بەر و بە لێوردبوونەوەیەکی کەم ڕاستییەکان وێنا دەکات لەگەڵ ئەوەشدا لە لابەلای ئەو ڕاستیە بچووکانەدا هەندێ بیرکردنەوەی پەرت وبڵاوبۆتەوە بەڵام هیچ کاتێك هەست بە هەموو ڕاستییە ناکەن.. بۆ نمونە ئێمە بە درێژای مێژوو هەوڵێکی فراوانی فەلسەفە بۆ دۆزینەوەی ڕاستییەکان دەگرینە بەر لە نێوان هەموو قوتابخانەکانی دا، زۆر بە جوانی سەرەوڕۆی و بێ مایەیمان بۆ ڕوون دەبێتەوە.. کە ئەوە"سابت" جێگیر دەکات کە فەلسەفە لە توانایدا نییە کە

راستییەکان بخاتە روو.!).. سەید پاشان دێت باسێکی قورئان دەکات و بە"بەرامبەر" دەڵێت (بەلاَم کاتێک کە مرۆڤ قورئان دەخوێنێت.. راستییەکانی عەقیدەی ئیسلامی دەست دەکەوێت و بیرکردنەوەیەك کە بە هۆی عەقیدەوە لە دڵی موسڵماندا پەیدا دەبێت.. پاشان دەیخاتە ژێر چاودێری و دەیەوێ ئەو راستیانەی لە فەلسەفە دەست بکەوێت. خۆی وەکو کەسێك دەبینێت کە لە باغێکی جوان و دڵڕفێندا دێتە دەرەوە و خۆی دەخاتە ناو قەلایەکی کۆنی سەدەی ناوەڕاست. کە پێچ پێچ و توولە رێگای زۆری تێیدایە و لەگەڵ نەسیمێکی نەسازدا، بێ دەرگا وپەنجەرە کە پەی بە رێگاکەدا نابات جگە لە سەر لێشێواوی هیچ شتێکی تر چاوەڕوانی نییە.) پاشان نکۆڵی لەوە دەکات کە فەلسەفە توانیبێتی مرۆڤی گەیاندبێتە راستی و گەیاندن بە خوای گەورە.. دەڵێت( فەلسەفە بە هەموو مەزهەب و قوتابخانەکانییەوە نەیتوانیوە رێنمای مرۆڤ بکات بەرەو رووی خوای"حق"(واجب الوجود) و یان(علت العلل). ئەوەی کە فەلسەفە لە یەکەم جار دەستی کەوتووە هیچ کاتێك نەیتوانیووە زاتی"الله" و خوایەك نییە کە ریسالە ئاسمانییەکان و سیفاتەکانی پێناسە بکات. وەکاتێك فەلسەفە

سەبارەت بە خوا قسە دەكات هەر وەك"ویل دورانت"ی ئەمریكا لە كاتی پێداچوونە وە خوێندنەوەی فەلسەفە دەڵێت: هەڵبەت فەلسەفە سەبارەت بە خوا قسە دەكات، بەلاّم مەبەستی ئێمە سەبارەت بەو خودایە نییە كە ئەوانەی بڕوایان بە ئاینگەری هەیە كە ئەو لە دەرەوەی سروشت و زانست تەماشا دەكەن. بەڵكو مەبەستمان ئەو خودایەیە كە فەلسەفە بڕوای پێی هەیە. خوایەك بریتی بێت لە یاسا و هەیكل و شێوەو ژیان و ئیرادەی ئەم جیهانە ماددمیەیە. گەر عەقلێكیش بوونی هەبێت كە ویستی ئەم جیهانە بە خواستی ئەو بێت ئەوا فەلسەفە پێی خۆشە ڕێنمای بكات تا بەرێزەوە هاوڕا بێت لەگەڵی..) سەید ئەو نمونەی"ویل دورانت"ی بۆیە هیناوەتەوە كە خوێنەر یا"بەرامبەر" ئاشنا بكات كە فەلسەفە مرۆڤ ناگەیەنێتە ڕاستییەكان.. بەڵكو ئەوە قورئانە كە ڕاستییەكان ڕوون دەكاتەوە.. وە سەبارەت بە فەلسەفەی فارابی و ابن رشد دەڵێت:(ئەوەی كە هەیە بەناوی فەلسەفەی ئیسلامی وەك فەلسەفەی"فارابی و ابن رشد" یا"علمی كەلام" و "علمی تەوحید" وە ئەو بیركردنەوەی كە لەوانەوە سەرچاوە دەگرێت لەگەڵ عەقیدەی ئیسلامی

مەودايەكى فراوانى هەيە.. لە بەر ئەوەى هەندێ لە موسڵمانان بيركردنەوە ئيسلاميەكەى خۆيان لە گەڵ بابەتە فەلسەفييەكان تێكەڵ كردووە، هەردوو بەشەكە شێوەى بيركردنەوەى ئيسلامى و شێوەى فەلسەفەيان پێكەوە گرێ داوە.. ئەوەشيان روون نەكردۆتەوە كە دوورە لە بەدڵەوە بوون.!! ئەوەش لە مێژوو روويداوە كە هەندێ لە بيرمەندان بۆ پاراستنى عەقيدەى خۆيان سووديان لە فەلسەفە وەرگرتووە. وە يان بە پێچەوانە هەندێ لە فەيلەسووفەكان بۆ پاراستنى فەلسەفەى خۆيان لە عەقيدە سووديان وەرگرتووە. وە ئەوەش ديارە كە هەركاتێ فەلەسەفە لە عەقيدە سوودى وەرگرتبێ ئەوا توانيويەتى هەندێ لە راستييەكان بە دەست بهێنێت.. بەلام گەر عەقيدە لە فەلسەفە داواى يارمەتى بكات ئەوا تووشى رووخان و لادان و سەرەورۆى بووە. سەيد قوتب كاتێ بڕواى بە فەلسەفەى ئيبسلامى هەيە كە لە ئيسلامەوە سەرچاوە گرتبێ.. بۆيە دەڵێت:( فەلسەفەى ئيسلامى بوونى نييە، ئەوەى كە هەيە هى يۆنانە، فەلسفەى يۆنانى.. بەلام كاتێك سەرچاوەكەى لە ئيسلامەوە بێت ئەو كاتە دەتوانين ناوى لێى بنێين فەلسەفەى ئيسلامى.)

# كۆمەڵگە ئیسلامی لە دیدو بۆچوونی سـەید قوتب..

تـەوەرەی بۆچـوونی شـەهید سـەید قوتـب= بـە تەواوی- لە سەر ئەو خاڵە بوو کە کۆمەڵگەی ئێمە- ئێسـتاش= لـەوەدا دەژیـن، هـەروەك كۆمەڵگـە نەفامییەکـەی مەککـە وایـە. كۆمەڵگەیەکـە کـە دەسـەڵاتی خـوای (سـبحانە)ی ڕەت کردۆتـەوەو بـە بەرنامـەو یاسـای خـوای لـەم ژیانـە هەڵویسـتێکی نییە.(ئێمە ئەمڕۆ لـە نەفامییەکدا دەژیـن هـەروەك نەفامییەکـەی پـێش مەککـە و بگـرە لـەو خـراپترو ترسـناکتر، گـیرۆدە بـووین. هـەر چـیەك لـە دەوروبەرمانـە هـەمووی نەفامییەتـە... بیرکردنـەوەکان، بیروباوەڕەکـان، نـەریت و خویـان، سەرچـاوەی کلتووریـان، هونـەرو ئـەدەبیاتیان، شەریعەت و یاسایان، وە تەنانەت بەشێك لـەوەی کـە ناوی لێ ی دەنێین" کلتـوری ئیسـلامی و سەرچاوەی ئیسـلامی و فەلسـەفەی ئیسـلامی و چـۆنییەتی بیرکردنـەوەی ئیسـلامی، هـەمووی دروسـتکراوی

هەمان نەفامییەت."ە وە کۆمەڵگەی ئیسلامی بەم شێوەیە پێناسە دەکات" کۆمەڵگەی ئیسلامی بەم شێوەیە...بە مانای کۆمەڵگەیەکە، کە پەرستنی خوا لە باوەڕو دەرونی هەر تاکیکی و هەروەها لە دروشم و پەرستن و یاسا و بوارەکانی ژیانیان سەقامگیر بێت... وە ئەگەر هەر یەك لەو لایەنانە بەم شێوەیە نەبێت، ئەوا بوونی ئیسلام بە تەواوی نەچەسپاوە... چونکە یەکەم پایەی هەمان شایەتی دانە بە (لاالە الا الله محمد رسو الله) یە...بەلاّم چۆنییەتی دروست بوونی ئەم کۆمەڵگەیە بەم شێوەیە باس دەکات" کۆمەڵگەی ئیسلامی تەنها کاتێك دێتە بوون، کە کۆمەڵێك لە ئینسانەکان پەیدا بن، وە گوێڕایەڵی خۆیان بو خوا بەتەواوی ئەنجام بدەن. وە گوێڕایەڵی هیچ خوایەکی تر قبوڵ نەکەن. چ لە بیروبۆچوون و چ ئەوەی لە دەوروبەر و چ ئەوەی لە پەرستن و دروشمەکان وە چ لە بەرنامەو یاسای خۆی لە ژێر پەرستنێکی پاك و بێگەرد ئەنجام بدات. وە ناخی خۆی لە بیرو بۆچوونی بۆ خوای تاك و تەنیا، بۆ هیچ خوایەکی تر= لە تەنیشت خوا= یان لە جیاتی خوا= پاك بکاتەوەو دروشمی خۆی لەبەر خاتری هیچ خوایەکی تر لە تەنیشت خوا= یان= لە جیاتی خوا= بۆ هیچ

خوايەكى تر ئەنجام نەدات. بەرنامەو ياساى خۆى لە هيچ خوايەكى تر لە تەنيشت خوا= يان لە باتى خوا- جێبەجێ نەكات. بەم شێوەيە- وە تەنها بەم جۆرەيە= كە ئەم كۆمەڵەيە، موسڵمانان و ئەو كۆمەڵگەيەى كە دروستيان كردووە، ئيسلامى دەبێت. لەبەر ئەوە تا كۆمەڵێك لە ئينسانەكان، بەو شێوەيەى كە باسكرا، پەرەستن و گوێڕايەڵى خۆيان تەنها تايبەت نەبێ بە خوا، ناتوانرێ ناوبنرێن مووسڵمان. وە تاوەكو ژيانيان خۆيان لە سەر بنچينەى ئەم ياساييە دروست نەكەن، كۆمەڵگاكەيان كۆمەڵگاييەكى ئيسلامى نابێت. چونكە بنچينەى ئيسلام و كۆمەڵگەى ئيسلامى يەعنى ئەم دووبەشە شايەتى دان بە( لااالە الا الله) و( محمد رسول الله). وە پاشان كۆمەڵگەى نەفامى بەم شێوەيە باس دەكات" بنچينەى هەر كۆمەڵگەيەك ، بێجگە كۆمەڵگەى ئيسلامى، كۆمەڵگەييەكى نەفامە! وە بە شێوەيەكى راستتر دەتوانرێ بوترێ: هەر كۆمەڵگەيەك كە گوێڕايەڵى و پەرەستشى و خۆى لە ناخ و بيروبۆچوون و دروشمەكان و بەرنامەو ياساكان بە لاى خواى گەورەدا نەبێ، نەفامييە."
لە سەر بنچينەى ئەم پێناسەيە، تەواوى ئەو كۆمەڵگەى كە ئێستا هەيە لە جيهاندا، لە چوار

چـــێوەی(کۆمەڵگەی نـــەفامی)دان.!! کۆمەڵگـــەی کۆمۆنیسـتی لـە پێکهاتـەی کۆمەڵگـەی نـەفامیین. چونکە، ئەوانە بە خوا ئیمانیان نییە وە بـە تـەواوی بوونی خوا رەت دەکەنەوە...

لەسەر بنچینەی کۆیلایەتی حزب دروست بـووە، نـە گوێڕایـەڵی خـوای گـەورەن، بۆیـە ئـەم بیرکردنـەوەو رێکخستنە، و تایبەتیەکانی مرۆڤ بـە شێوەیەکی تـر پێداویســـتیە ســـەرەکیەکانی ئـــەو هـــەر ئـــەو پێداویستییە ئاژەڵیەیـە یـەعنی: نـان و ئـاو جـل و بـەرگ و شـوێنی حەوانـەوەو غـەریزە جنسـییە. و پێداویستییەکانی(رۆحی مـرۆڤ) و بێـی ئـاژەڵی، کـە ئـەوە لـە پـێش هەموویانـەوە بـاوەڕبوون بـە خـواو بوونی ئازادی لە بیروبۆچوونی هـەر تاکێـك دادەنـێ.

کۆمەڵگەی بـت پەرەسـت کـە ئێسـتاش نمونـەیان لـە ولاتـــان زۆرە وەك هنـــد، ژاپـــن، فلیـــپین و ئەفریقا...ئەمانـەش لـە چوارچـێوەی کۆمەڵگـەی نـــەفامیین. چـونکە یەکـــەم" بـاوەڕبوونی ئـەوان جێگیرە لەسەر دان پێنانی هەر خوایەکی تر جگە لە خوا=لە تەنیشت خوا=یان= لە جیـاتی خـوا=. دووەم" دروشمی گوێڕایەڵی خۆیان بۆ خوایانێك یان بۆ ئەو پەرەسـتگا سەرپێچـیکەرانەی کـە تـاك و تـەنیای ئەوانیان قبولٚ کردووە.

**کۆمەڵگەی جولەکەو مەسیحی تەواوی دونیان، هەم لە چوارچێوەی کۆمەڵگەی نەفامیین. چونکە ، بەوە بڕوا لادراوەی خۆیان، سنوورێکیان بۆ تاك و تەنیای خوا دانەناوە، بە شێوەی جیاواز، شەریك دانان وەك: (نبوت) و (تثنیث) و بوونی خەیاڵی نەشیاو لە و خواو ئەوەی پەیوەندی بە دروستکراوەکانیەوە هەیە. وە رازی بوون شەریك دانان بۆ خوا.**

## نامەی سەید قوتب بۆ خوشکەکەی ئامینە !

ئامینــە گیــان! لــەم رۆژگــارەدا هەنــدێك وا حســاب دەکەن کە دانان بە گەورەی خوای گەورە، بە مانـای هـیچ و پووچـی ئینسـان و کـەم بوونـەوە لـە رێـزو حورمـەتی ئینسـانە لـەم بوونـەدا. تـۆ بڵێـی، خـوای گەورە و ئینسان لە گەوەرەی و هێـزدا دژی یـەك بـن و مونافەسەی یەکتر بکەن...! بەڵام بـڕوای مـن وایـە کە هەر ئەندازەییەك ئێمەی ئینسانەکان، هەست بـە گەورەی و خوای گەورە بکـەین بەهـەمان ئەنـدازەش هەست بە رێزو و حورمەتی خۆمان دەکەین، چونکە دورستکەراوی دەستی ئەم خواییـەن!! ئەوانـەی کـەوا گومان دەبەن بە ئینکاری کردن و بچوکردنی خـوای گەورە بتوانن خۆیان بـەرز بکەنـەوە، کەسـانێکی بـێ نرخ و کەمن کە دیدو بوچۆونیان ئەوەنـدە کورتـە و سـنووردارە کـە بـەر پێـی خۆیـان بـە زەحمـەت دەبینـن...وە واش دەزانـن کـە ئینسـان لـە کـاتی بـێ دەسەڵاتی و بێ توانای پێش گەورە بـوونی خـۆی بـە ناوی خواوە پەنای بردوە و ئێستاش کە لە ئەوپـەڕی دەسەڵاتی و هێزدایە ئیتر پێویسـتی بـەو نییـە و تـۆ چی دەزانی؟! لەوە دەچێ هێزو سەروەت پەردەیـەك

بێت بدرێت بەسەر چاو و دڵیانەوە کە لە کاتی بێ توانیاییندا!! بەڵام راستیەکەی ئەمەیەو زۆر بەجێیە، کە ئینسان هەرچەند تواناو دەسەڵاتی زۆر بێت، زیاتر هەست بە گەورەیی خوای گەورە دەکات، چونکە لەو کاتەدا هێزێکی گەورە لە خۆیدا دەبینێت، پێویستە سەرچاوەکەشی لە بیر نەکات! ئەوانەی کەئیمان و بڕوایان بە گەورەیی خوای گەورە هەیە، نە تەنیا خۆیان بە بچوکی و هیچ و پووچی نایەتە پێش چاو بەڵکو هەست بە عززەت و سەربەرزی دەکەن.. خوشکەکەم! هەندێ جار کۆیلایەتی، خۆی لە پۆشاکی ئازادیدا دەبینێتەوە و بەم شێوەیە ئازادی بە مانای: ئازادی لە هەر قەیدو بەندێك، ئازادی لە هەر یاساو و عورفو عادەتێك، و ئازاد بوون لە هەر جۆرە بەرپرسیارێتیەك لەم جیهانەداو...! هەڵبەت تۆش دەزانی کە لە مابەینی ئازاد بوون لە کۆتی زەبوونی و زەلیلی و فشار و ئازاد بوون لەهەر بەرپرسیارێتیەك کە جیاوازیەکی گەورەی هەیە، چونکە یەکەمی، دەربازبوونێکی راست و دروستە بەڵام دووەمی دەست کێشانەوەیە لە هەر بنەما و پێکاهاتەیەك کە بناغەی ئیناسەنیەتی ئینسانە، و مایەی دەربازبوونێتی لە هەر فرت و فێڵێك کوت و بەندێکی قورسی ئاژەڵیە. ئەم جۆرە

ئازادیـە کـە تێکـەڵاوی غـەریزەی ئاژەڵیـە بریتیـە لە(ئازادیـەکی دەمامکـدار)، چـونکە لـە راسـتیدا، کۆیلایەتی لە بەرامبەر ئارەزووەکان و داخوازیەکانی ئینسـانیەت، تەمـەنی درێـژی لـە رێگـەی رووبەڕووبوونەوە لە گەڵ ئەوان بردۆتە سەر تا لـەو شـاڵاوە ئارەزووانـە دەربـاز بێـت و بگاتـە لووتکـەی ئـازادی ئەسـڵ و ئینسـانی خـۆی...! بەڕاسـت بۆچـی ئینسان لەوەی کە پێویستیەکانی ئاشکرا بکات شـەرم دەکـات؟! بۆچـی؟! لەبـەر ئـەوەی بـە فیتڕەتـی خـۆی هەسـت دەکـات کـە پێویسـتیەکانی کـە شـایەنێتی هەیبێت یەکەمین چینی ئینسانیەتە کە رزگـار بـون لە کۆت و بەنـدەکانی ئازادیـەکی راسـت و دروسـتە و بۆ زاڵ بوون بەسـەر غـەریزە ئاژەڵایەتیەکانـدا و زاڵ بـوون بەسـەر هۆکـارە لاواز و زەبونیەکانـدا هـەردووکیان لـە پێدانی گـەورەی و سـەخاوەتیدا بـۆ ئینسان وەك و یەکن!

ئامینـە! چـەندە بـۆم قورسـە تەنانـەت ئەگـەر بـە مێشکمدا بێت کە ئایا دەتـوانرێ بـە سوود وەرگـرتن لە هۆکارێکی غەیری یاسای بگەیتە ئامانجێکی پاك و پـیرۆز؟! چـونکە ئامـانجی پـاك لـە دڵێکـی نـوورانی و روحێکی پاك گەشـە دەکـات، ئـەی چـۆن خـاوەن ئـەم دڵ و روحە پاکە بۆ گەیشتن بە مەبەستەکانی خۆی،

دەست لەم جۆرە ئیشانە وەر ئەدات و تەنانەت بە مێشکشیدا بڕوات؟! مەگەر دەکرێ بۆ رۆیشتن بۆ روبارێك لە ناو قوڕو سیاناوی دا بڕۆین بێ ئەوەی کە بە لاشەی ئێمەوە بێت؟! لەسەر ئەم رێگایە ئەگەر هۆکاری غەیری یاسای بگرینە بەر ناخمان پیس و پەڵە پەڵاوی کردووە و شوێنەواری ئەم پیسیە لەسەر روح و دەرونمان ئاشکرا دیار دەبێت، دەگەینە ئەو ئامانجەی کە بۆی چوین!!

ئامینە! خوشکەکەم چەند جار تاقیم کردۆتەوە و بۆم دەرکەوتووە کە لەم دونیایەدا هیچ شتێك ناگاتە لەزەت و خۆشی روح بە دڵدانەوەی کەسێك و شادکردنی و یان پشت بەستن و هیوا لە دڵێدا، ناگات. لەزەت و خۆشیەك کە بە تەواوی بونەوە هەستی پێ دەکەین..ئەم لەزەت کردنە تام و چێژی ئاسمانی هەیە کە لە زەویدا بوونی نییە. وەك بڵێی وەلامێکە بۆ ئەو بانگە پڕ گەوهەرە ئاسمانیە کە لە سروشتی ئێمەدا بوونی هەیەو بێ نیازە لەو پاداشتەکەی، چونکە خودی ئەو چێژو لەززەتە باشترین و باشترین پاداشتە..!!

ئامینە! خۆشکە ئازیزەکەم، ئیتر لە مردن ناترسم گەر بە پیریشمەوە بێت و لێی ڕا ناکەم، چونکە بەڕاستی لە ژیاندا زۆر شتم وەرگرتووە(بەدەست

هێناوه) باشتر وایە بڵێم بەخشیومە...!جیاوای لە نێوان بەخشین و وەرگرتن هەموو کات ئەوەند ئاسان نییە لەبەر ئەوەی لە دونیای روح هەردووکیان یەك مانایان هەیە هەر کاتێك شتێکم بەخشیبێ هەر ئەوەشم وەرگرتۆتەوە!! هەڵبەت نەك بەو مانایەی کە کەسێك شتێکی بە من دابێت بەڵکو هەر کاتێك شتێکم بەخشی بڵێت شتێکم وەرگرتووە، واتە من بە ئەندازەی کەسانێ کە شتێکم پێی داون خوشحاڵم!! بۆیە ئیتر لە مردن ترسێکم نییە ئەگەر بەرەو رووشم بێت چونکە هەر شتێك کە لە توانامدا بێت و پێم کرابێت کردوومە وە زۆر شتی تر هەیەکە ئەگەر زندوو بمێنم پێم خۆشە ئەنجامیان بدەم، بەلاّم ئەگەر نەمتوانی بیکەم خەم و ناخۆشی دڵم ناگرێت چونکە کەسانی تر هەن کە ئەم ئیشانە بکەن. ئەگەر ئەم بابەتانە شایەنی بوون و مانەوەیان هەبێ هەرگیز نامرن...چونکە دڵنیام کەسێك کە چاودێریکەری ئەم بوونەوەرە دەکات هیچ خێرێك یا خوود بیرکردنەوەیەکی بە سوود نایەڵێ بمرێت و لە ناو بچێت. ئیتر لە مردن ناترسم ئەگەر بە پیریشمەوە بێت چونکە لە رێگای خێرو باشەدا ئەوەی پێمکرا بێت و لە توانامدا هەبووبێت کردم لە هەڵەو گوناحەکانم پەشیمانم و دەیانسپێرم

بە خوای گەورەو بەبەزەیی. ئومێدم بە رحم و بەزەیی ئەو هەیە. تەنبێ و گلەی کردنی ئەو ناراحەت نییە بۆم، چونکە ئازاردانی هەرچۆنێك بێت راست و بە جێیە. منیش عادەتم کردووە کە عوقوبەی کارەکانم بگرمە ئەستۆی خۆم و بەرگری بکەم لە رۆژی دوایشدا، نەتیجەی باش و خراپی کردەوەکانم قبوڵ دەکەم...

# ئەمریکایەك كە من بینیتم

ئیسلامی ئەمریکا

لـەم رۆژگـارەدا ئـەمریکا وهاوڕێکـانی گرنگـی بـە ئیسلام ئەدەن.. ئامانجی رانەگەیاندراویان لە لابەلای ئـەو گرنگیدانـە، پێویسـتیەکانیانە بـە ئیسـلام تـا بتـوانن بـەو هۆیـەوە لـە ئاسـیای ناوەڕاسـتدا هێـزی کۆمۆنیستی زۆر بکەن.. ئەمـەش لـە کاتێکدا ئـەنجام ئەدرێت کە رۆژئـاوا بـۆ خـۆی لـە مـاوەی نـۆ سـەدەدا واتــە لـە رۆژگـارانی شـەڕی سـەلیبی تـا ئێسـتا لـە ململانێدایە لەگەڵ"علیه السلام"!! ئـەمریکا ئـەمڕۆ پێویستی بە ئیسلامە، بەو شێوەی کـە پێویسـتی بـە ئەڵمانیا و ژاپۆن و ئیتاڵیایە.. لە کاتێکدا ئەمریکا لە شـەڕی جیهـانی دووەم هـەمان ئـەو وڵاتانـەی لـە جموجوڵ خست.. مەر ئـەمڕۆ، ئـەمریکا لەگـەڵ ئـەو هەموو شت و مەکەی کە هەیەتی لە رووی ئـابووری، چەك و چۆڵ و راگەیاندنەی هەوڵ ئەدات تا ئەمانـە دووبارە بکەنەوە سەر پێ و بە هێز بن. تا ئەوان بکا بە کژ یەکێتی سۆڤیەت.. و بـەدەر لـەوەش نییـە کـە هـەر ئـەم ئەمریکایـە توانـای ئـەوەی بـۆ فەراهـەم بێتـەوە، تـا ئـەم وڵاتانـە لـە دوای گەیشـتن بـە

ئامانجیان، دووبارە لە جموجۆڵیان بخات، لە هیچ شەڕێکدا دەست ناپارێزێ و مەخابنی بۆ ناخوات.. بۆیە ئیسلامێك کە ئەمریکا لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست گرنگی پێ دەدات، ئیسلامێك نیە کە دژی داگیرکەر بجەنگێت.. وە نە ئیسلامێکیشە کە دژی ستەمکاران بجەنگێت.. بەڵکو ئیسلامێکە کە تەنیا لە بەرامبە کۆمنیست بوەستێ.. ئەو نایەوێ کە ئیسلام دەسەڵات بگرێتە دەست.. وە نەشیتوانیوە بەرگەی ئەو جۆرە ئیسلامە بگرێت.. چونکە کاتێ کە ئیسلام دەسەڵات دەگرێتە دەست، ئەوا نەتەوەکان بە شێوەیەکی تر پەروەردە دەکات.. لەو کاتەدا ئیسلام فێری نەتەوەکان دەکات کە توانا و ئامادەبوون لە بەرامبەر دوژمن، وە بەدەستهێنانی پێدەوایستیەکانی شەڕ بۆ ململانێ لەگەڵ دوژمن پێویستە.. نەتەوەکان فێر دەکات کە راونانی داگیرکەران لە ولاتدا فەرزە، ئەوە فێری نەتەوەکان دەکات کە رژێمی هاوبەشی کۆمۆنیستی هاوڕێ لەگەڵ رژێمی داگیرکەری رۆژئاوای، هەردووکیان زاوڵی هەموو ولاتانن، هەردوو دوژمنی ولاتانن و هەردووك دەسڕێژی بۆ سەر مرۆڤایەتی"ئادەمیەت".. لە سەر هەمان مەبەست ئەمریکا وهاوڕێکانی لە رۆژهەڵاتی ناوەند

ئیسلامێکی ئەمریکایان دەوێت.. هەر لەم رۆژگارەشدا کە دەنگی ئیسلام لە هەر شوێنێك بڵندە.. لە بڵاوکراوەکانی میسر و لەوێ قسە لەسەر ئیسلامە.. وە بابەتە دینیەکان لاپەڕەکانی تەواو رۆژنامەکان و گۆڤارەکانیان پڕ کردووە.. تەنانەت هەندێ لە بڵاوکراوەش کە بۆ رۆژێکیش هیچی بڵاونەکردۆتەوە تا بگات بەوەی ئیسلامناسی و ئیسلامدۆستی نیشان بدات.. ئەوان لەبارەی ئیسلامەوە دەنووسن و .. بە ئیسلامدا هەڵدەڵێن.. هەندێك لەو بڵاوکرەوانە ئەمریکاین.. لە میسر کتێبخانە و چاپخانەیان هەیە.. وە مانگانەش یەکێك لە بڵاوکراوەکانین بە بابەتێکی تایبەت دیاری دەکەن، ئەوان لە ناکاو تێگەیشتن کە ئیسلام پێویستە هەندێ بابەتی سەرەکی ببێتە هەندێك لەو کتێبانەی کە مانگانە بڵاوی دەکەنەوە.. هەندێ لە نووسەرانی بەناوبانگ کە لە نووسین و راگەیاندندا بە سوودی هێزی هاوپەیمانی دژی ئەڵمانی نازی لە شەڕی جیهانی، شەو و رۆژیان کردبوویە یەك، کە بابەتی ئیسلامی کاریگەریان دەنووسی.. وە بەتەنهاش سەرکەوتنی هێزی هاوپەیمانی، ئیسلامیان لە بیرکرد.. دووبارە دەستیان کردووە بە پێدا هەڵگوتن بەسەر هێزی هاوپەیمانی دا. ئەوان

لەم رۆژگارەدا روویان کردە ئیسلام و وە بە سوودی ئیسلام دەنووسن.. وە زانایانی ئەمرۆ لە فش و فاڵدان و خەریکی پیاهەڵدانی کۆشکی پاشایەتین.. وە لە راگەیاندنەکانی خۆیان پێشبڕکێ لە نێوان ئیسلام و کۆمۆنیست دەکەن.. کە خەڵاتی گەورە بۆ براوەکان دادەنێن بە شێوەیەکی تایبەت. بەڵام ئیسلامێك کە دژی داگیرکەر بجەنگێ- کە ئەوەشی لێ داوادەکرێت تا لەگەڵ کۆمۆنیزم بجەنگێ- ئەو ئیسلامە کەس قسەی لەسەر ناکات.. وە ئیسلامێك کە لەسەر کاروباری ژیانی دەسەڵاردارەتیەت بێت، لە سەر ئەو ئیسلامەش کەس لەسەر نانوسێت. بێ منەتە لەوەی کە سەبارەت بە چۆنیەتی مەنعی سکپڕی لێی بپرسێ.. بێ منەتە لەوەی کە حوکمی چوونە ناو پەڕلەمانی ئافرەت چییە.. راستە کە لە ئیسلام بپرسێ دەست نوێژ چۆن دەشکێ.. بەڵام هیچ کاتێك نابێ بەدوای کاروباری کۆمەڵایەتی و ئابووریمان و رژێمی مالیمان لەسەر کام بنەڕەت وبنچینە دابنێین.. نابێ لە ئیسلام بپرسێ کە رژێمی سیاسی و نەتەوەییمان چۆن بێت.. ئەو فتوایای لە نێوان نەتەوەی ئێمە و داگیرکەر هەیە نابێت لە ئیسلام بپرسێ.. ئیسلام و دیموکراسی، دادپەروەری ئیسلامی، چاکە لە ئیسلامدا.. ئامانە بابتانێکن کە

هـیچ بـاکی نیـە کـە ئەگـەر سـەرەبابەتی بابـەتێك یـاخود کتێبێـك بێـت. مەگـەر حاکمیـەتی ئیسـلام، شەریعەتی ئیسلامی، هەوڵ و کۆش بـۆ سـەرکەوتنی ئیسلام.. لەم بابەتانەدا نابێت کەس قسە بکات و نـە کەسـێکیش لەسـەر بنووسـێت و نـە فتوایـەك لـەو بـارەوە بپرسـێ. پاشـان ئەوانـە تێگەیشـتن کـە لـە ئیسلامدا رژێمی مالی هەیـە کـە نـاوی زەکاتـە و گـەر ئـەو بیروبـاوەڕە لـە بیرکـراوە لـە روژهـەلات دووبـارە سـەرهەڵبداتەوە، دەتـوانێ ببێتـە هـۆی سـەددێك لـە بەردەم زۆربوونی کۆمەلگەی کۆمۆنیزمی..

بۆ ئەمریکا، نەك بۆ خوا

ئێمە ئاگادارین کـە "عبـدالحمیـد عبـدالحق" وەزیـری کاروبـاری کۆمەلایـەتی ئـەو کـات، کـاتێ دەویسـت کـە باسـی زەکـاتی لـەبیرکراو بکـات و دوبـارە زینـدووی بکاتـــەوە.. وە ئـــەو بابەتـــەش لـــە پەڕلەمانـــە دەســـتکردەکەی ئـــەو کـــات بـــاس بکـــات.. هـــەموو گەورەبەرپرسان دەکەوتنە لۆمـە کردنـی.. لەکاتێکـدا کە ئەو وەزیری کاروبـاری کۆمەلایـەتی بـوو!! کاتێـك کـە ئـەمری زەکـات لـە لایـەن خـواو بێـت هـەموو بەرپرسان و خـاوەن دەسـەلات هەڵدەسـتنە سـەر پـێ بۆی. بەلام کاتێك ئەمری زەکات لە لایەن ئەمریکاوە بێـت هـیچ کەسـێك جورئـەتی نییـە بچـوکترین

کاردانەوە لە بەرامبەری نیشان بدات. بەو هۆیەوە لێژنەیەکیان پێکهێنا لە مامۆستایانی"پوهنتون" و هەندێك لە زانایانی ئەزهەر و هەندێك لە کەسانی دەسەلاّتدار تا لە دیاردەی تەکافولی کۆمەلاّیەتی و بە تایبەت زەکات بکۆڵنەوە.. ئەوەش نەك بۆ خوا، نەك بۆ گەیاندنی بە بێچارەکان و نە بۆ نیشتیمان دۆستی.. بەڵکو لەبەر ئەوەی ئەمریکا ئاوا دەیەوێ. لەگەڵ ئەوەدا زۆربەی ئەو ئەنجومەنە زۆربەیان لە گەورەکان و دەوڵەمەندەکان بوون.. لیکۆڵینەوە لەو کاروبارە خەتەرێکە بۆیان کە هەڕەشەیە بۆ سەریان و ئەو سەرمایەی هەیانە دەیخاتە ژێر پرسیارەوە.. گەر ئەمریکییەکان حیکمەتی زەکات و تەکافولی کۆمەلاّیەتیان بە شێوەیەکی سەرەکی وەرگرتایە و بیانزانیایە.. رژێمەکانی رۆژهەلاّتی ناوەند وای لێبکات کە ئەو ئەمرە"مبدا" دووبارە دەست پێ بکاتەوە و لەسەر هەموو جێ بە جێ بکرێت.. لە بەر ئەوەی لە بەرامبەر بلاّوبوونەوەی کۆمونیستی، رێگر لەمە باشتری لە بەردەست نییە. ژیانی چینایەتی کە رژێمی کۆمۆنیستی کە ئەبەدەن لە بۆ رێشەکێشکردنی ئەو جۆرە ژیانە دروشم بەرز دەکاتەوەو هەموو بەلەنگاز و دەوڵەمەندێك دەخاتە گۆڕێکەوە، بە خێرای لە نێوان نەتەوەکانی

ڕۆژهەلآتی ناوەند کە لە ژیانی چینایەتی دەناڵێنن زوو بلآودەبێتەوە. وە تەنها ڕێگایەك کە ئەمریکا بتوانێ بەو هۆیەوە ببێتە ڕێگر لە بلآوبونەوە کۆمۆنیستی لە نێوان نەتەوە نەدارەکانی ڕۆژهەلآتی ناوەند، هەر ئەو ڕێگەیەی زیندووبوونەوەی ڕژێمی تەکافولی کۆمەلآیەتی ئیسلامیە کە لە زەکاتدا شاراوەیە. دوای ئەو ئەنجومەنەی کە باسکرا کە چی بکەین تا خۆیان لەو کۆسپە ڕزگار بکەن و بە سەلامەتی دەرچەن. ئالێرەدا دەست دەکەن بە فێڵ کردن، ئەمریکیەکان نابێت لە هەموو نهێنییەك بزانن، بەو هۆیەوە سوود لە کارامەی شەیتانیەی کە هەیانە وەردەگرن.. لە کۆتاییدا ئالوگۆڕکێ پێ دەکەن.. هەندێك کە ئیسلام لە ئەمری زەکاتدا لە سەرووی ڕاسولمال دایناوە دیاری کردووە لێی کەم دەکەنەوە.. بە کورتی دەستووری زەکات بەو شێوە نیشان ئەدات کە هەندێکی زۆر بێ نرخادنە و کە شایەنی باسکردن نیە لە بنەڕەتی سەرمایەکە دەیگرێ.

وە بۆشیان شایەنی قبولکردن نییە کە بڕوا بە نیوەی قورئانیش بکەن.. وە بە نیوەکەی تر بڕوا نەکەن، وە لە فرۆشتنی ئایەتی قورئان لە بەرامبەر هەندێ پارەی کەم هەم ئاشناییان نییەو،

چاکەکاریشـن.!! ئەمانــە لــە بنــەڕەتی یاریەکــە تــێ ناگــەن و ئــەمریکاش لــە ئامانجەکەیــدا بــە راســتگۆ دادەنــێین، تــا ئێســتاش زۆر پــێ داگــری دەکــەن کــە هەموو نهێنیەکی تەکافولی کۆمەڵایەتی لە ئیسلامدا و دەســـتووری زەکـــات لـــە ئیســـلامدا بـــەو شـــێوە بنەڕەتیــەی کــە لــە لایــەن خــوای گــەورەوە هاتۆتــە خـــوارەوە لەگـــەڵ هـــەموو روونکردنەوەیـــەکی فەلسەفەکانی پێشکەشـی ئەمریکایەکانی بکەن.. وە لای بەرامبەر ئەوانەی دژین لەگەڵ ئەم رایەدا لە کێشمەکێشی توونـدان لەگـەڵ ئەوانـەی تـردا.. کـە تەنها خوای گەورەش دەزانێ دەگەنە چی ئەنجامێك. ئەمـــە هـــەموو بەدبەختیـــە. بـــەڵکو هـــەمووی لـــە تیاچووندایە.. مەگەر جێگای خۆشحاڵی ئەوەیە کە ئیسـلام هاوڕێیـانێکی هەیـە.. ئیسـلام کەسـانێکی هەیە کە تەنها لەبەر ئـەو هـەوڵ ئـەدەن.. کەسـانێك کە لە ئیسلامدا لە بەرامبەر داگیرکەر و کۆمۆنیستی و هەموو ستەمکارێك بە یەکسانی بەرگری دەکەن و هەموویان بە یەك چاو تەماشا دەکەن.. کەسانێك کە دەیانەوێ کە ئیسلام لە ژینـی خۆیـدا و لـە کۆمەڵگـە دەسەڵاتدار بێت تا بەرهەمی هەبێت.. کەسـانێك کـە دۆســـتی دەســـتکردی چەلیپای"خاچـــی"، ئـــەوان ناخەڵـــەتێنێ و دەشـــزانن کـــە ئـــەم

چەلیپایانە"خاچپانە" نۆ سەدە لە ململانێدا بوون لەگەڵ موسڵمانان.. بۆیە هیچ کاتێك نابن بە هاورێ. خۆشەویستانی"هاورێیانی ئیسلام" هیچ کاتێك لە پێچ و پەنای ئیسلام سوودی تایبەتی خۆیان ناوێ. ئەوان لە ئیسلامدا دادپەروەرەی کۆمەلایەتیەکی تەواویان دەوێت.. ئەوان ئیسلام ناکەن بە ئامێرێك بۆ خزمەتی داگیرکەر و ستەماکاران.. ئەوان ئیسلام بە مایەی سەربەرزی و رێزی خۆیان دەزانن. ئەوان ئیسلام وەك بانگەشەی وەرناگرن، بەڵکو ئیسلام بە ئاسمانی رێگەی بەرگری و ململانێ و بەرزخوازی دادەنێن. بەلام ئەوانەی کە ئیسلام وەك ئامێرێك بۆ بازرگانی و بەدەستهێنانی چێژی دونیا وەردەگرن، کەسانێك کە دین وەك یاری و گەمە وەردەگرن و کەسانێك کە سوچ وکەناری رۆژهەلاتی ناوەند، دین وەك رزق و فتوا، کە وەك ئامێرێك دەدەنە پاڵ سوودی تایبەتی خۆیان، ئەمانە هەمووی وەك چیلکەیەکن لە سەر رووی ئاو کە لە کاتی جووڵەی ئاوەکە لە سەرچاوەی ئەسڵیەکەی لەگەڵ باقی پیسیەکانی و ناپاکیەکانی تر لە سەر رووی ئاوەکە دەشاردرێنەوە!! وە دووریش نییە کە ئەو کاتەی کە ئاوەکە لە ئاوەرۆ ئەسڵییەکەی خۆی دەست بە جووڵە بکاتەوە.. زووتر لەوەی کە هەندێك وا گومان

دەکەن.

( انهم یرونه بعیدا و نراه قریبا )

خوای گەورە لە حاڵی ئەوانەی کە ڕۆژی دوایی بە دوور دەبینن بەو شێوە فەرموویەتی.. ئەوان ئەو دوور دەبینن، لەکاتێکدا ئەو نزیکە.

( وعد الله الذین آمنوا منکم و عملوا الصالحات لیستخلفنهم فی الارض کما استخلف الذین من قبلهم و لیمکنن لهم دینهم الذی ارتضی لهم و لیبدلنهم من بعد خوفهم امنا یعبدوننی لا یشرکون بی شیئا )

خوای گەورە بڕیاری داوە کە کەسانێك ئیمانیان هێناوە لە ئێوە و کردەوەی چاکیان ئەنجام داوە کە ئەوان دەکەینە جێگری سەر ڕووی زەوی وەك ئەوانەی کە پێش ئەمان پێمان بەخشی بوون وە دینێك کە ئەو بۆیانی هەڵبژاردووە ئەو دینەی ئەوان بۆیان زاڵ و تەواو و دەسەڵاتدار دەکەین.. ترس و دڵەڕاوکێ یان بە ئەمن و ئاسایش دەگۆڕینەوە.. ئەوان تەنیا عیبادەتی ئێمە دەکەن.. و هیچ شتێکیش ناکەن بە شەریك لەگەڵ من.

# پارچە شعرێکی سەیید قوتب

اخي انت حر وراء السدود

اخي انت حر بتلك القيود

ئەی برام! تۆ لەپشت ئەم دیوارانە ئازادی، لە گەڵ بوونی ئەم کۆت و بەندە سنووردارکراوانەدا ئازادی!

اذا كنت بلله مستعصما

فما ذا يضيرك كيد العبيد

چۆن پشت بە خوا ببەستێ، ئیتر فێڵی بەندەکان چ زیانێکت پێ دەگەیەنن؟

اخي هل تراك سئمت الكفاح

والقيت عن كاهليك السلاح

برام ! وا دیارە کە لە جەنگ ماندوو بووی و چەکت لە شانت فڕێ داوە؟

فمن للضحا يا يواسي...الجراح

ئەی باشە کێ یە قوربانیان سەبووری بدات و برینەکانیان هەتوان بکات و

ويرفع رايتها من جديد

دووبارە ئاڵاکەیان بخاتەوەو سەر ئەتزاز

اخي انني اليوم صلب المراس

ادك صخور الجبال الرواس

برام! من ئیمرۆ بەهێزو توانام، پارچە بەردی بەهێزی و دامەزراوی کێوەکان لێ ی دەدەم و وردی دەکەم

غدا" ساشيح بفاس الخلاص

رووس الافاعي الي ان تبيد

سبەی بە تەور سەری"ئەفعیی"ەکان پان دەکەمەوە تا لە ناو بچن

اخي ان ذرفت علي الدموع

و بللت قبري بها في خشوع

برام ! گەر لە سەر گۆڕەکەم فرمێسکت رژان و بەو خشوعەوە تەڕت کرد

فاوقد لهم من رفاتي الشموع

وسيروا بها نحو مجد تليد

لە ئێسکە وردەکانم مۆمانێك دروست بکە و مەشعەلێکی لێ دروست بکە و بەرەوڕووی بڕۆن

اخي ان نمت نلق احبابنا

فروضات ربي اعدت لنا

برام! ئەگەر بمرم دەچمە دیداری دۆستانم و باغەکانی پەروەردگار بۆمان ئامادە،

و اطيارها رفرفت حولنا

فطوبي لنا في ديار الخلود

و باڵندەکانی بۆمان باڵدەگرنەوە و بۆیە خۆشی بۆ ئێمە لەسەر زەمینی هەتا هەتای

اخي انني ما سئمت الكفاح

و لا انا القيت عني السلاح

برام! من لە جەنگ"روبەڕوبوونەوە" ماندوو نەبووم و چەکم لەسەر شانم دانەناوە..

فان انا مت فاني شهيد

وانت ستمضي بنصر جديد

برام! ئەگەر من مردم بەڕاستی شەهیدم و تۆش بۆ سەرکەوتنی تازە دەچیتە پێش

ساثار لكن لرب و دين

و امضي علي سنتي في يقين

بەمزوانە تۆلە دەکەمەوە لە بەر خاتری خوا و دینەکەم"نەك خۆم" لەسەر ڕێگای خۆم بە دڵنیای و یەقینەوە دەچمە پێش

فاما الي النصر فوق الانام

واما الي الله في الخالدين

یان بەرەوە سەرکەوتن بۆ هەموو دونیا، یان بۆ لای خوا لە بەهشتدا لەگەڵ "مانەوەوان" لەوێدا

# چەند وتەيەكى سەييد قوتب...

بيرو وهزرو ووتەكانمان وەكو لاشەيەكى مردوون كە دەمێننەوە، تا ئەو كاتەى كە لە رێگايدا گيان دەبەخشين و بە خوێنى خۆمان ئاوياری دەكەين كە لەو رووەو گيان دەكەوێتە بەريان و لە نێوان زيندوويياندا دەژين..

.............................................................

ئەم قورئانە نهێنى خۆى تەنيا دەداتە ئەوانەى دەجەنگن و خەباتى گەورەى لە پێناودا دەكەن.

.............................................................

ئەوانەى كەوا گومان دەبەن بە ئينكارى كردن و بچوكردنى خواى گەورە بتوانن خۆيان بەرز بكەنەوە، كەسانێكى بێ نرخ و كەمن كە ديدو بوچوونيان ئەوەندە كورتە و سنووردارە كە بەر پێ ى خۆيان بە زەحمەت دەبينن

................................

بێ گومان هەر وتەيەك كە زيندوو ماوەتەوە، گيانى دڵى ئينسانێكى گرتووە!!

................................

هەرگیزا و هەرگیز ئیسلام نەیویستووە خەڵکی ناچار بکات عەقیدەی ئیسلامی وەربگرن.. بەڵام خۆ ئێستا"عەقیدە" نییە. بەڵکو ئیسلام رزگارکردنی مرۆڤی لە مرۆڤپەرەستی..

...............................

ئەم قورئانە نهێنی خۆی تەنیا دەداتە ئەوانەی دەجەنگن و خەباتی گەورەی لە پێناودا دەکەن.

...............................

بیرو وهزرو ووتەکانمان وەکو لاشەیەکی مردوون کە دەمێننەوە، تا ئەو کاتەی کە لە رێگایدا گیان دەبەخشین و بە خوێنی خۆمان ئاویاری دەکەین کە لەو رووەو گیان دەکەوێتە بەریان و لە نێوان زیندوویاندا دەژین

دەقەکان بە تەنیا هیچیان پێ ناکرێ.. کتێبیش بە تەنیا هیچی پێ ناکرێ.. تەنانەت گەر کەسێکیش بێت!! بیر و بۆچوونەکانیش ناژین تاوەکو نەکرێین بە کردار!!

...............................

نەتەوەی موسڵمان ((زەوییەك)) نییە کە نەتەوەی موسڵمانانی تێیدا بژی و((گەلێك)) نییە کە باب و باپیرانیان سەدەیك لە سەدەکانی میژوو کە بە دەستووری ئیسلامی تێیدا بژین.. ((نەتەوەی موسلمان)) کۆمەڵە کەسانیکن ژیانیان و وێنایانیان و

کاروباریان و دەستووریان و بەهاکانیان لە پرۆگرامی ئیسلامەوە دەبیّ!!..

..............................

هەر خەفڵەتی جەماوەر بوو لەو سەردەمەدا فیرعەونیشی سەرلیّشیّواو کرد و فریودا.. بەڕاستی هیچ شتیّك بە ئەندازەی خۆخافڵکردن و خۆبیّ ئاگای تاغیەی زەمانە یاخی ناکات.. چونکە ئەو دەبینیّ هەرچی دەڵیّ و هەرچی دەکا هەر فەرمان بە جیّیە.. ساتیّ دەبینیّ هەمووان پشتیان بۆ دانواندووە.. ئیتر زۆر بە ئاسانی سواری پشتیان دەبیّ.. دەبینیّ ملیان بۆ دانواندووە و سەریان شۆڕ کردووە، ئیتر ئەوانیش زیاتر زاڵ دەبن و گەلیش عیززەتی خۆی لە دەست دەدا و ئەمیش یاخی تر ئەبیّ و ئەوانیش ریسواتر ئەبن و لە ئەنجامدا هەردوولاشیان تیا دەچن.

..............................

لە بیروباوەڕی ئیسلامیدا گوناهی بۆماوەیی((کە لە ئادەم و حەوا بۆ نەوکانی مابیّتەوە))بوونی نییە. بەڵکو ئیسلام بیروبارەڕی وایە کە هەر کەس بەرپرسی کار و رەفتاری خۆیەتی و گوناهی هەر کەسیّك پەیوەندی بە خودی
خۆیەوە هەیە و بۆ هەموو کات دەرگای تۆبە کراوەیە!!..



سەیید لە ژێر چاودێریدا



سەیید بەرەو پەتی سێدارە

لەم رۆژگارەدا ئەمریکا وهاوڕێکانی گرنگی بە ئیسلام دەدەن.. ئامانجی رانەگەیاندراویان لە لایەلای ئەو گرنگیدانە، پێویستیەکانیانە بە ئیسلام تا بتوانن بەو هۆیەوە لە ئاسیای ناوەڕاستدا هێزی کۆمۆنیستی زۆر بکەن.. ئەمەش لە کاتێکدا ئەنجام ئەدرێت کە رۆژئاوا بۆ خۆی لە ماوەی نۆسەدەدا واتە لە رۆژگارانی شەڕی سەلیبی تا ئێستا لە ململانێدایە لەگەڵ "علیة السلام"!!



نرخ (۳۰۰۰) دینار